# کردمائج قنجه لی نزانن

کرد قنجن وخوینا وان حمی ناموس ، رومت وجسارته · ژلورا ولو رادبن هڤدود کژن ومالین هڤ دخون

یك ژوان سری خوه ژ ئەدن ره ناتوینه · ژبر کو چاڤی خوه دِ ڤی ایشی ده ڤکرنه · چه خورتی کو نو رادبەچاڤی خوەل قنجي یی دگرینه هر دبینه میری قنج رمشهور کو خلك پسنی وی دیده أوه کو میران د کژه وتالانان دتینه وسره خو ژ بربری خوه ره ناتوینه ·

أو خورت ژی رادبه دست بِ کشتن ، تالان وبربری یی دکه وخباتکه زور دخبته چما کو ژ یره پسنه · حچی میری کرده کو کته ایشکی هر دخوازه کو ل پشیبا هڤالان به · پر جاران ژی أم دبینن کو یکی کرد بِ چند هڤالان ره — کونه ژملتی وی — د کڤه ایشکی ، گر خوه ندن به ، میرانی به ، گر حمالی به أوی کرد لِ پیشیاهڤالین خوه حمیانه · چما طبیعت و جسارتی وی قبول ناکه کو کس ل پیشیا وی ببه ·

هکه ملتی کردژی میناڤان ملتین دن کو ایرو پیشده چونه ، زانا بونه دی دیسان لِ پیشبیا هڤالان حمیان بونا و دِناڤ ملتان ده مشهور ببونا ، لی پیچکی شونده مانه ·

درمانی زانابونی ژی أڤه · حچی کو کرده و دبیژه از چیلی یی کردانم دڤی آریکار یا جڤاتا خیری بکه ، هر کس لِ گورا حالی خوه ، دا کو جڤات ژی بکاره منفعتکی لِ مه بکه ، زارووین مه بده خوه ندن ودبستانان بینه دڤی دری ین مه · مانەچیتره کو ام شیست هفتی زیرین زر لِ یك زاروکی بدن حتا کو ام لِ باژارکی ژڤان ئین دور بدنه خوەندن ؟ أو شیست هفتی زیر ژِ جڤاتاخیری ره بت أم د کارن صد زاروکی پی بدن خوه ندن · ژِ بر کو اوی دبستانا بینة دڤي دریی مه ، مصرف لِ زاروکان ناچه ·

ت' تشت ژی مروڤان زانا ناکه ژ خوه ندنی پیڤه ·

**جمیلی حاجو**

---

گەرامة وەسەر رەیاول نازانم حالي بوی که غزلی (بطرزقدما) یش نقر ببێ به مقصد یکي وا نوسراوه ؟ که وابو رنگه معذورم ببینن · ئه گه رله ٣ زباندا ( کوردی فارسي ، تورکي ) اشعار وغزلیاتی بنده تچاپ بي كه وتەوەخویندوته تەوه البته له مسلکم تی گه یشتوی · مع مافیه له رغمي ئه مانه وله رغمی ئه وه تی که به خلاف عقیدەی ایوه ادبیاتی بی عشق وبه تعبیری صحیحي ( ادبیاتی بی خطوخال ) له نظرمندا وه کو ( آوینه ی مس ) وابه · دیسانه وه تقدیری به رزی حسیات وبلندی مفکوره تان ئه کم · چونکی من ازانم ایوه کین ····؟

**حلیم رفقی**

—هرو کی مه ژِ نسخا پیشین ڤه گوتیه هاوار ، هاوارا کردان ، هاوارا هر کرده · ژلوراەمه بندا ژورین کو جها بکه بلاڤ کر · هکه ( نوروز ) دل کوو لی ڤگراند رو پلین هاواری ژ یرەژی ڤکوی نه ·

**هاوار**

---

جمیلی حاجو— نڤیسڤانی بندا ژورین جمیلی حاجو به · گلو جمیلی حاجو یه کی یه · جوانه ، پیره ، لِ کو دِ کیژان دبستانی ده خوه ندیه ·

هرو کي دِ انجامی ده کفش بت هیژایه کو أم بکڤن پی ڤان پرسیا ریان و لِ وان وگرینن ·

جمیلی حاجو خورتکی بیست ، بیست و یك سالی یه · ز، کتیەت' دبستانان ، و بر دستی ت' کسی ده ، نه بِ

# جوابنامە

بو ( نوروز ) ي مستعـار خاوەنی مقاله ( زمان ) کە بە سەر لوحەی ( بوشاعر یکی کورد ) له ژماره ( ٢٤ ) ی زاری کرمانجیدا نشر کرابو ٠

مقاله یك کە حەوت سـال له مه و پیش له تنقیدی شعر یکدا له دفتری خـاطراتي خوتا نوسیوته ایروأیخه— یته ساحەی انتشاره وه وله جر یدەی ( زاری کرمانجی ) دا عرض خو یندە وارانی ئه کەی ٠ ئه مه همت ووته وانا یکی به رزه ، جن‌ی تقدیر و تشکره ٠ امیدم وایه که ئەو دفتری خاطراتت خز ینه یکی زنگین ورنگین و بە اعتباری محتو یاتي تحفه یکی نو ینی گران قیمت بی ٠ هر چند تنقیدە کت بە راستی معقول ومقبوله بە لام اگەر عاجز نه بي دە کیم : که بونشری‌أو تنقیده‌له انتخابي‌زماندا اصابت نه کردوه ٠ چونکی تنقیدی تعلیك اصولاً یاله وه ختی کردنی او فعله داو یاله عقیبـه وه دە کر یت ٠ اگەروا نەبوایه تأریخ‌بوایه نه دە بو به درەی عبرت٠ ثانیاً تنقید یك ئه بي توجیهي هدفیکی معین بکری ٠ اگە روانه بی بی عکس صدا امینیتە وه ٠ ولەم نوعە تنقیدیش نه ، خو یند واران‌له حقیقت آگادا رأبن‌واستفادەا کەن، ونەاو کسەی تنقیدیش اکر یت له خوی آگا ٠ له به رامه به بي مدافعه ی نفس محکوم و بەم تحر یشی البته معذور ئه مینیته وه ، من لیره دا هرزه و کیلی نا کەم اگەر تنقیده کەت موجهی منیش نه بی ، چونکی تنقید هل اگر یت له نو سینه وەی ئەم جوابە دا خوم‌هر بەمصیب ازانم ٠ مع مافیه ایوه تنقیدی شعر یك اکەن که حوت سال له مه و پیش نشر کراوه وله میانه ی تنقید دا ئه فرمو یت که « چه ملتکی ترهیه له عصری فن وعلمدا له زمانی عرفان وصنعت دا شـاعره پرهوشه کانی له پاش هه مو رابورا دنیك له شعر دا باسی (مژکان وچاوی کال ولیوی آل و بکەن ؟ ) ٠ ئەم سواله تان له چه درجه یکدا له گە ل حقیقت تطابق ئه کا له وه بحث نا کەم ٠ فقط وا ازانم که حقم‌هیه تنقیده کتان موجهی‌خوم بزانم ٠ چونکی‌من تقر یباً هشت سال له مه و پیش‌له شه شه مین ژمارەی‌غزته ی(امیدی استقلال) دا غزلیکم نشر کردوه که ئه مه مطیلەه کە یە تی : (مار زلفت نو یه چی خزنەی عقیقي آل ئه بی ٠ تیر مژ گان پاسه رانی دوری چاوی کالـــ نه بی ) ٠ دقت ئه فرموی که عبارهٔ ( مژ گان وچاوی کال ولیوی آل و ٠٠ ) که حرفیاً له مقاله کتان‌وه ر گیراوه‌له گەل مطلعی‌غزله‌کم چندە منا— سبتداره؟ ٠٠٠ جاری له پیش هه مو شتیکدا عرضتـان اکم که من له و تنقیده تان زور متحسس و پی خوشحال بوم٠ چونکی دو بارەی اکه وه قصه کانتان حقه وراسته له گه ل امه یشدا ( ذمیکی تحت المدح ) ه ، چونکی دوو به شی مقاله کتان دلالت له بلندی موقع وشخصیتی ( منتقد ) ئه کاله نظرا یوه دا انجاله به رأمه ی من لا یقی ام تقدیراته نه بوم ده میك له نوسینه وەی جوابدا متردد مـامه وه ٠ فقط فکر یك که جسارتی جواب نوسینه وه و ( خوتی هل قلا ندنی ) پی بخشیم اوه بو که له تقدیرا نه که تاناوه کو تنقیده کتان نا مصیب ین ٠ والا اگر له جهت تنقیده که تانه وه له عدمی اصابتتان امین ن. بومایه ممکین نه بو خوم بە وشخصه بە رزه بزانم که ایوه تنقیدی ئه کەن ٠ بە لی لطفاً اگرتماشای‌سرلوحەی‌غزله کتان بفرموایه وتوری لی‌یە وورد ببونایه وه ده تان زانی که اوغز له بو تجر بە یکی قلم واه ژ یر مقصد یکدا نوسراوه چونکي سه رلوحەی ( بطرزی قدما ) و بالخاصه‌شعر ومقاله کاني پیش ئه ونسخه یه کافیه بواظهاری مقصد ٠ بەم مناسبته وه حکایتیکي بچو کتان بو بگرمه وه ٠ : — سه رده میك دیسانه وه له غزه ته یکي بچو کدا چند شعر ومقاله یە کم نشر کرد له شعره کاندا زورم سعي ئه کرد که لا سایی‌شعراتازه کاني تورك بکه مه وه متجدده بە میشکه کاني وه کوتو زوریان قدیرا کر د ٠ فقط روژ یك له مجلسکیدا بعض له وتجدد پرورانه یش حاضر بون که ( قدما پرست ) یك هجومي کرده سەرم وتنقیدی کردم له جیاتی مدافعه بە اسلو بی کون چند شعر یکم نشرکرد که ئه واومثالی اوئەو لی یان معلوم بو له ومیدانه شداله ( قیر قاچ ) لانادەم دو باره

## بهریێن

### — شیر بلیبی خوه —

میرگ وزڤی خربه نه
گند وقصر تربه‌نه
بلبل مری گل مری
ئه‌رز مایه نه تری

نه گل و نه کلیلك مان
نه پاریز وگلستان
نه دنگی خوش نه مقام
پیڤه ژآه و انتقام

چاڤین بوکان بهیسترن
کند دگرین دسترین
نه پز مانه نه شڤان
نه بلور و بلورڤان

گلی چیا گواهین
نه خلام ونه شاهن
دشت ونوال بخوینن
دیروکا مه دخوینن

ریل و دحلك بونه زر
زڤی ، بوکن کزیزر
خوه‌لی بونه خرابه
یزدانی‌مه ده رابه

بجامیری نکارن
ببی بختی دکارن
أم ژی کرن وکورن
ژ پرا وان دبورن ۰

نه قصر ما نه مربان
نه میرك ما نه سلطان
نه صاغی ما نه مرن
هیمه‌مه ژی دبرن ۰

کن ڤمری گرین ما
درمان چو و برین ما
کچك چو و کزی ما
و آهکه رزی ما :

گلستان بو کڤرستان
بر چاڤین‌من کردستان
آر یکاری‌مه نینه
هیڤی ، چراکی بینه

چاڤی بنفش هشینه
سوسن ژی کت بشینه
نه گیا ما نه ریحان
ل پاریزی کردستان

نه ما ، لی لی ، نه‌لو لو !!
قرك ، کند ، گر وایلو
دکنن خدان سازن
کذبامه دخوازن

میرگ وزڤی خربه نه
گند وقصر تربه نه
بلبل مری گل مری
نه رز مایه نه تری !

هاوار چو و هیسترما
ئژدی مر و هیشترما
مامك کرت و درپژه
«شیر بلیبی‌خوه» دبیژه ۰

**دکتور کامران عالی بدرخان**

---

بوه ، و کوردانی زه‌مانی پیشو فکرو میشکی خویان ، آوانی دیلیان ، همو به هه لبه ست ریك خستوه ۰ ودَستیان کیر— دوه ته بیژینو گوتنی أو هه لبه ستانه به گورانی ۰

کوردانی پیشو — هر وکو به شیك له کوردانی ایروش — آواني دبلی خویان به‌هه لبه ست داناوه ، و أو هه لبه ستانه یان به گورانی گوتوه ، له دامنی چیایان ، یان له سه‌ر رووباران ، یان له سه‌ر کانی و سه‌ر چاوه کان به بلور یان به شمشال أو هه لبه ستانه یان گوتوه ۰

انجانه خته نه‌خته أمه سه رکه‌وتوه ، و حه زبان نه کیردوه احوالی پاله وانانیان ، چیروکی جوانو شیرین و قنجیـان ته نیا به هه لبه ستیکی گورانی ببیژین ، وهر به وه‌بمیننه— وه ۰ به شکو دستیان کیردوه‌ته ریکخستنی أو شتـانه ، أحوالی أو پیاوه بلندانه به چه ند هه لبه ستیکی چیروکی ی دورو دریژ ودَستیان کیردوه ته بیژینی وخوبند نه‌وه‌ی له به ینی خو یان دا ۰

هه‌ر بهو چه شنه أدبیاتی کوردی له‌پایه‌ی گورانی‌یه‌وه سه رکه‌وت بو پایه‌ی چیروکی ، و کوردکان دَستیـان کیرده دانانی هه لبه ستی چیروکی ، یان ریکخستنی چیروکی خویان به شکلی هه لبه ست ۰

انجا چونکه أدبیاتي کومیدی به‌ستراوه به قومه بلنده متمدنه کانه وه وزور پیویستی مدنیته و چونکه هیشتـا هه تا کو ایستا که به ته واوه‌تي پیروشکه‌ی هه تاوي مدنیت وولاتی کوردستانی روناك نه کیردوه‌ته ، وه و شـارانو دیهاتي کوردستان به به رگی جوانی مدنیت نه رازاوه ته وه ، له به‌ر أوه ادبیاتی کومیدي له کورد ستاندا‌ده‌ر— نه که وتوه و ادبیاتي کوردی هیشتا نه گه یشتوه ته‌پایه‌ی سییه م ۰

( ته واو نه بوه )

**هڤندی صوری**

# ادبیاتی کوردی ٢

أوانه که که موزور معلوماتیکیان هه یه له أدبیاتی زیمانانی اوروپا ده زانین که له زمـانی کونەوە هـه تا کو ایستا که له سەرمی پایه سەرکه وتوه وایستا کەش أدبیاتی اور پا ده بیتەمی چه شنەوە ٠ أویش : أدبیـاتی گورانی ، أدبیاتی چیروکی ، أدبیاتی کومیدی [ تمثیلی ] ٠

أدبیاتیاوروپا — وبه تایبه تی أدبیاتی یونانی کون — له پایەی یه که مینی دەرکه وتنی همو عبارت بو له گورانی، ولەو دەمه یونانیه کان فکرو میشکی خوبان به هه لبه ست (شعر) ریك دخیست و دستیان دکیردەبیژینی أوهەلبەستەبه گورانی ٠ أو شتانه که له دیلیان دجولایه وه همویان ریك دخیست به هه لبه ستی گورانی ، که ده گه ران لەناوشاخو دولانی یونانستان ، یان که داده نشتین له سەر روخیبحری [ ایجه ] ، ده نگیان هەلدەبری ودستیان د کیرده گورانی بیژین ، هه تا أوەندەی پی نه چو أحوالیان گوررا ، و دستیان کیرده مدح کیردین و هه لبه ست هه ل دان له سەر پیاوانی گەورە ، قارمانان ، و پالەوانانی خوبان ، هەندی جار أو هه لبه ستانه یان در یژ دکیردەوە وهر به مدح کیردنش نه دەمان ، به شکو دستیان د کیرده ریکخستنی ژیانی أو پیاوانه : له دایك بونیـان ، گەورە بونیان ، خو و رەووشتیان ، مردنیان به هەلبه ستیکی دور و دریژ و به شو قیکی گه رمەوە دستیان د کیرده بیژینو گوتنی أو هەلبه ستـانه : به کورتي یونانیه کانی کون هەلبه ستی چیروکی یان دادەنا ، یعنی أدبیاتیان له پایەی گورانیەوە سەر که وته پایەی [ چیرو کی ]

انجا رأنگاو یکی ] وختیکی دریژ أدبیاتلەپایەی چیروکی مایەوە ، هەتا نه خته نه خته سەر کەوت و گه بیشته پایەی [ کومیدی ] ، انجا هەر لەو دەمەوە بو که أدبیاتی کومیدي له آوروپا پیدابو و بلاو بو وه ٠

أمه پابه کانی سه ر که وتنی أدبیـاتی وولاتانی روژ آوایه ٠ وئەمه پایه کانی سه ر که وتنی أدبیاتی گه لانی آریه ٠ آیا له وولاتانی کوردستـان رو وه ر گیر ینه دواوه وبنور ین له تاریخی أدبیاتی ، أم پایانه ده بینین یان نا؟؟ ٠٠

مادام أدبیاتی کوردی أدبیـا تیکی آری یه ده بي وه کو أدبیاتی زیمانانی روژآوا وابیت وده بی به سـه ر أو پایانه دا سەر که و بتیت ٠

به لی : أدبیاتی کوردی له زەمانی کونی پیشودا « گورانی »

---

ژبونا آریـکا ر بیا کردستانی یه ، خوینـامن ژبوناشرو رژاندنی یه ! ! ! »

له هاواردا و یته ی چیایانی خو ینن ؛ ودولانی گول گولی رەنگی ولات ، ونمونه ی مردایه تی شیرانه ی کوردئه بینین ٠ ٠ ٠

له هاوارا ٠٠ له ناو بەرگی ئه و کوڤاره کوردیه دا هیوای ژیان ئه چیژ ین ، غونچەی آزادی به خوین گه شاوه بون ئه که ین دلیکی به هیزا له تەنگانه پرورده کراودا ئه بین ٠ ٠ له هاوارا کوردیکی تازه گەنجی کی آزاد ٠ ٠ ژیانیکی شیر ین ئه بینین بو یه پی ویسته شه‌و ‌وروژ ( هاوار ) بکه ین وله یزدان بپار ینه وه و بلین

« بژی هاوار ٠ ٠ بمین خیوی هاوار »

تاو کودەنگی هاوارمان ئه کاته پەردەی گردگار دستی خوینا و یمان داوینی دوشمن ئه گری زاری وشك وتینومان آوی علم وفن وزانستی ئه نوش ئەوسا به چنگی اسنین و کوه، تو جەرکي دوشمن درهینن تواه ی باف وبرای خومان بسندین ٠ ٠ ٠

ایتر ٠ ٠ ٠ ٠ بژی هـاوارا ٠ ٠ ٠ ٠ بمین خیوی هاوار ٠٠٠٠

سەرژیر

سال ١ — هاوار — هژمار ٧
پینجشمب — بری — ٢٥ تباخ ١٩٣٢
کوڤارا کردی

## له هاواردا

له هاوارا دلیکی نواوه، جگه ریکی خو بنین ، چاو یکی پر فریسك ئه بینم .

له بی دهنگی شـهودا لهنیو دهنگی گریانی منالانی بی باوك وژنانی بی روله، ونالینی جوانهمهرگاندا دهنگی(هاوار )م دیته گوی ، نازك ... دلگیر ...

لام له تیژ ترین آوازی موسیقی حزین شیرین تره دیته گویم ئهو دهنـکه ئه سپابیه ههرو کوشنهی نهسیم ، ورشهی گیا ، نالهی قمری ، قاسپهی کهو، وتاڤگهی آڤی رو بار ...... دیته گویم وکو آهی حزینی سهرهمه ... رگان .... بی چرپه ، بی سیروه ... بی دهنگ ... .ه نگ ... له ترسی چاڤی بدان ، وله سامی دهستی دشمنان بـ ئه سپابیی دیته گویمهوهآه . . ناتوانم بلیم چه کاری له دلم ئه کات ؟ !

ناتوانم بلیم چهیادگاری له دماغمدا راست ئه کانهوه له چه په ریکی دلم ئهدا ! ! ؟ له کام اعصابم ئهکهوی !

دهنگی هاوار له شامهوه دیته گویم له پاش ئهوهی دهشت وبیابانی بیگانه ( بیانی ) وکیو وکژی خومان ئهبری به لام تأثیره کهی نا گورری له دلی مندا ، نهك بهتنهـا ههر له دلی مندا بهلکوله دلی همو کوردیکیدا . گولی سیسی هیوا ئهگه شینیتهوه ، مـهبلی آزادی تازه ئه کاتهوه ، له پریشانی و پارچه پارچهیی خومان ئهگهین .

له هاواردا له اسمانی بی ته می آدابدا دورله ئنی سیاست بی ئهوهی که زرهی زنجیری اسار تمان بیته گوی، وکله پچهی عبودیتمان چاوبی بکهوی، یادستی خو یناوی دشمنان ببینین .. دور لهمانه لهبن ســی به ری داری هیوادائه حهسینهوه نسیمی سربستیوآزادی ههل ئه مژین ، حس به شیرینی ژیان وخوشی سهربه خوبی ئه کهین له هاواردا هڤالی برا کورده جکر خوینـه کانمان ئه زانین، شیوهی پ، شیوی ژنی هه ژاری نهزانی کورد ومنـالانی گـیرودهی بی باڤ برائه بینین .

له هاواردا گیانیـکی بلنـد ، دلیـکی به هیز ، چنگی کی آسنـین گهردنیـکی آزاد ، ودامنی کی پاك ئه بینین که همو یان له له شیـکدا گرد بونـهوه وبدنگی کی بهرز ( هـاوار ) ئه کات وئه تی :

« دلی من ژبوهژ کرنا کردستانی یه ، خرنبیا من

# كتيبخانا هـاوارى

هژمار
١

ريزانا الفابى با كردى

غروش سورى

ب چرمى خملاندى ١٢،٥٠

ب چرمى عادتى ١٠

ژ بونا درفه دقيت حق پوستى ب سر بدت خستن



## اشتراكات مجموعة هـاوار

في سورية وتركية والعراق و بلاد العجم و بلاد القفقاس

عن سنة واحدة ٥٠٠ غروش سوري — ١٠٠ فرنك
عن ستة شهور ٣٠٠ غروش سوري — ٦٠ فرنك
عن اربعة شهور ٢٠٠ غروش سوري — ٤٠ فرنك

وفي غير هذه الأقطار

عن سنة واحدة ١٥٠ فرنك
عن ستة شهور ٩٠ فرنك
عن اربعة شهور ٦٠ فرنك

المراسلات يجب ان تكون باسم صاحب الجريدة : دمشق — حارة الأكراد

سال ۱ — پینجشمب

# هاوار

بیژی

هژمار ۷ — ۲۵ تباخ ۱۹۳۲

## کوڤارا کردی

### تیـدە خستییین کوڤاری

| | |
|---|---|
| کردمانج قنجن | جمیلی حاجو |
| جمیلی حاجو | ج ۰ ع ۰ بدرخان |
| له هاواردا | سه رژ پیر |
| ادبیات کردی | هفندی صوری |
| میری من | دکتور ك ۰ ع ۰ بدرخان |
| جوابنامه | حلیم رفقی |
| زاری کردمانجی | هاوار |
| میشو وخدو | هر کول آز یزان |
| الفاییا کردی | ج ۰ ع ۰ بدرخان |
| فرهنگوك | هر کول آز یزان |
| برین | دکتور ك ۰ ع ۰ بدرخان |
| ای فجر | لاوکی کرد |
| هسنکر | قدر بجان |
| دلالی عیشی | ستراڤان |

۱۳۵۱ ﻫ — مطبعة الترقي بدمشق — ۱۹۳۲ م

SAL 1
HEJMAR 8
DUŞEMB
12 Ilon 1932

# HAWAR

ANNÉE 1
NUMÉRO 8
LUNDI
12 Septembre 1932

## Qovara Qurdî * Revue Kurde

## Têdexistiyên Qovarê



## Birê Frensizî



Çapxana Tereki
ŞAM — 1932

# QITÊBXANA HAWARÊ

**HEJMAR**

**1**

## Rêzana Elfabêya Qurdî

**Note sur l'alphabet Kurde**

Bi çermê xemilandî 12,50 K. S.
Bi çermê adetî 10 K. S.
Ji bona derve divêt hekê postê bi ser bêt xistin.

---



---

## Abonnements

Pour la Syrie, la Turquie, la Perse l'Irak et les pays du Caucase:

| | |
|---|---|
| 1 an | 100 fr. |
| 6 mois | 60 fr. |
| 4 mois | 40 fr. |

Pour tous autres pays:

| | |
|---|---|
| 1 an | 150 fr. |
| 6 mois | 90 fr. |
| 4 mois | 60 fr. |

*Adresser* toute demande au directeur propriétaire: Emir D. A. Bedir-Khan
Damas: Quartier Kurde

## Qirîyarîya Qomelê

Ji bona Sûrîya, Tirqîya, Ecemistan, Irak û welatên kevkasê:

| | | |
|---|---|---|
| Salqî | 500 kirûş-sûrî | — 100 frenq |
| Şeşmehqî | 300 kirûş-sûrî | — 60 frenq |
| Çarmehqî | 200 kirûş-sûrî | — 40 frenq |

Ji bona welatên din:

| | |
|---|---|
| Salqî | 150 Frenq |
| Şeşmehqî | 90 Frenq |
| Çarmehqî | 60 Frenq |

Her tişt bi navê xweyî têne şandin:
Şam : Taxa Qurdan

SAL 1
HEJMAR 8
DUŞEMB
12 Ilon 1932

# HAWAR

ANEÉ 1
NUMERO 8
LUNDI
12 Septembre 1932

Qovara Qurdî * Revue Kurde

## Şêranîya Zmanê Qurdmancî

Weqê ez gehiş'im Bêrûtê roj çû bû ava û sê saet ji şevê derbas bû bûn.

Sibetir, berî nîvro, ji mêvanxanê derqetim, min da qûçe û qolanan, û gehiştim meydana Burcê. Dinya germ, ba şil, bihna mirov teng dibû, diçiqiha.

Min xwe da ber siha Kehweqê, canê xwe divêsihand.

Burc meydaneqe fireh û drêjqî ye. Di nava wê de parîzeqî qiçiq lê spehî heye.Bi giya, bihnûn û daran xemilandî ye. Tê re aveqe qiçiq dibihure û diqeve nav bêrmeqe teniq. Erda bêrmê ji qevirên şehqirî û benevşgon raxistî ye. Rengê avê têde winda dibe. Pêrm weq zevîyeqe benevşîn xuya diqe.

Li serê meydanê, sê qûçeyên mezin-ji baqur, ji rojhelat û rojava—xelqê bajêr ditînin û lê dirijênin.

Xelq di nav qûçeyan de mîna robaran diherîqin. Ev sê robarên qo di meydanê de dıgehin hev, dibin lehîqe boş û xwe didin ber parîzî. Di ber caxên parîzî re pêlên lehîyê dişiqên û lehî dibe du bir, bireq di ber rastê û birê din di ber çepê parîzî re diherîqe, heta piştî Serayê, paşê, dilopên lehîyê, ber bi behrê ve, ji hev diqevin û belav dibin.

***

Xelq di ber min re dibihurîn .Pîr û ciwan, jin û mêr, dewlemend û belengaz; ji her rêzê, ji her rayî, ji her nijad û miletî.

Min ew ji belg, dêm û serçavên wan nas diqirin.

Carinan şefkeqî gewr û pehn bi şaşiqeqî qesq diqetin be , qumeqî sor di ser çariqeqê re dikelikî. Jiniqeqe ziqmezin, weq deneqî, gêr dibû û diqet-pişta qeçiqeqe narin û bejnzrav.

Ev e, pêxwaseq, qaşo bê hemdê xwe destên xwe di ser hêt û navqelên van pîreq û qeçiqan re digerîne.

Min canê xwe vêsih ındi bû. Pabûm, qetim nav pêl'n lehîyê. Ji nişqê ve, ji qolaneqê, çend serîyên bi qum û destmal li min der bûn.

— Ne lol... hê zû ye... ma çiman... dev jê berde... Ĥeso digot... na herê.. guh mede....

Ket ne dihat bîra wan qo ez jî bi zmanê wan dizanim, qo ez jî yeq ji wan im.

Ji xwe ji min re zilameq divîya bû qo hûrmûrên min hilgire, bibe mêvanxanê. Min deng li yeqî qir.

— Xorto,heqe vala yî bi min re were.

Xortê qo min deng lê qiri bû, ji hevalên xwe veketiya û da pey min.

Heta qo em gehiştin diqaneqê min deyn ne qir. Li diqanê min cixareyeq da wî û me dest bi axaftinê qir.

— Xorto, tu xelqê qû derê yî ?

— Ez xulam, ez bedlisî me

Lê zmanê wî ne zarê xelqê bedlisî bû, min got:

— Ma çire dibêjî qo bedlisî yî, ji zmanê te qilş e qo tu ji dora Mêrdînê yî.

— Belê, xebera te rast e, lê ez eslê xwe dibêjim. Ez bedlisî me, lê di mihacirîyê de derqetim û di dora Mêrdînê de bi xwedî bûme, ber vê yeqê...

— Qengê hatiyî Bêrûtê?

— Ev bû saleq û hin, min ez xulam tu ji qûjan welatî yî?

— Divêt tu jî, ji zmanê min bizanî

— Gora zmanê te tu ji welatê Botan î, lê di vî bajarî de tu botî nînin.

Pêleqê seqinî. Qi'şbû qo difiqrî û di bîra xwe de li tişteqî digeriha. Di pey re, rabû ser xwe, hat destê min û got:

— Ez xulam, li sûçê min menêre, min aniha tu nas qirî. Ji xwe min bihîsti bû qo yeq ji we li Bêrûtê ye. Min dil diqir ez herim ziyareta wî lê min fedî diqir. Xwedê ji min re li hev anî

— Belê yeq ji me li Bêrêût ye, lê ew ne ez im, ew brayê min e. Ez li Şamê rûdinim.

Di pey re ez û xweyîyê diqanê em qetin bazara qaxeza Hawarê. Ji xwe ji bona qirîna qaxeza Hawarê hati bûm Bêrûtê.

Min şuxlê xwe quta qiri bû. Qaxez bi rêhesinê bihata rêqirin. Tinê qaxeza çermî min bi xwe re bibira. Xortê min çermê Hawarê qir piştî xwe û me da rê.

Em çû bûn diqaneqe din. Min bi xweyîyê diqanê re xeber dida. Qurdmancê min di qurçiqeqê de li ser tetiqan rûnistî li min dinêrt û diqenî. Min jî bi devqeneqê jê re got:

— Xorto, tê xêr e, çire diqenî?

— Xêr e ez xulam, ji qifa qurdmancîyê, ji qêfa qurdmancîya te diqenim. Belê li Bêrûtê qurdmanc zehf in. Ji sibê heta evarê em bi qurdmancî xeber bidin. Lê gava ji devê te dibihîzim hêj bêtir qêfa min jê re têt. Ax ez xulam, tu nizanî qurdmancî çiqas şêrîn e.

— Na herê. qurdmancî qengê bûye şêrîn

— Bi serê te ê ezîz, tu zman weq qurdmancî nê şêrîn e. Ez bi tirqî rind nizanım, lê min ew geleqî bihîstiye. Li Irakê min erebî û ingilîzî geleq bihistine. Li Sûrîyê her rûj erebî û frensizî dibihîzim. Ez van datînim ber hev û dibînim qo şêranîya zmanê qurdmancî di tuwan de nîne. Le çi fêde ew bi qurdmancî nizanin

— Ma bizanîyana çi dibû?

— Hingî, ji qurdmancîyê pêve bi tu zmanan xeber ne didan.....

*Celadet Alî Bedir - Xan*

## Rêya Teze

Rûjnameqe qurdmancî, bi herfên nû, bi qurdmancîyeqe xwerû, li Rewanê, di şiqleqî spehî û çeleng de derdiqeve.

Vê paşîyê çend hejmarên wê gehiştine destê me. Çavên me pê birûhn bûn, dilê me şa û geş bû.

Qurdmancên Rewanê ji rûjnamê pêve çend qitêb jî derêxistine. Me sê çar rûj mijûlahîya xwe bi wan qirin.

Ji nav rupelên wan ên taze û ter bihna qulîlqên çiyayê Elegozê, bayê zozanên Serhedan dihatin. Di nav resmên wan de şal - û - şapiqê qurdmancî, xencer û piştxencera qal û qaliqên me dihatin ditin.

« Rêya Teze » weq navê xwe taze ye, nû ye, nûbar e. Lê ji Hawarê qevntir, bi emr jê mezinter e. Hejmara wê a paşin qo gehiştiye destê me a pencî û nehan e. Li gora qo Rêya—Teze rûjnameqe dehrûjqî ye, berî salqê û hin dest bi derqetinê qiriye.

Ev çend beytên jêrîn ji qitêbeqe qurdmancên Rewanê ye:

Eyşê, Kurban, rabe j'xwê
Herin meqtebê. dersxanê
Welatê qitêban pir şêrîn e
Meriv li wê dinya dibîne
Dê û bavê me tarîyê da bûn,
Ji dinê bê hes, bê xeber bûn.
Dîsan ji wê qitêbê şihreqe zaroqan:

## Strana Dilan

Lêvên te du pêt in
Çavên te stêr.
Diranên te mirarî
ilê te dêr.

Ava bi ronahî
Weq Zerdeşt î
Dinê û ezman î
Mêrg û deşt î.

Sor î rohelat î
Deng û nay î
Buhar û blûr î
Brûsq û ba yî.

Porên te zêr û zer
Canê te zîv
Tu bibe ji min re
Taştê û şîv.

Taûsê arper î
Qenîna bûq
Biqene dimirin
Baqur û pûq.

Tu ewrên ezman î
Tu qesqesor
Li ber lamên te lez
Dimire sor.

Tijî hêvîn tu î
Hesret ji tu
Zana û ferzane
Şiret jî tu.

Çûqeqe delal î
Dengeqî çaq
Qanîya zelal î
Weq berf î, paq.

Xwesteqa min tu î
Strana min î
Mêqewa min tu î
Şivanê min î.

Xezala min tu î
Çavên te reş
Ez beranê te me
Sînga min geş.

Pêşnivejê te me
Tu mizqeft î
Dilê min ezman e
Têde stêr î.

Di çavê' roj û hêv;
Ronahî tu,
Li kesra spehiyan;
Avahî tu.

Sînga te çiyâ ye
Tu agir î
Li buhiştê hêvîn
Pêxember î.

Bêqes im û tinê
U bê dotmam
Di vê dinyayê de
Bê govend mam.

Qulîlqa Adar î
Bıhna buhar î
Tu deng û hawar î
Stêra êvar î.

Pêşnivêjê te me
Tu mizqeft î
Dilê min ezman e
Têde stêrq î.

Porên te zêr û zer
Canê te zîv
Tu bibe ji min re
Taştê û şîv.

*Dr. Qamiran A. Bedir-Xan*

## Dawet e

Ji zozanan hat kuling
Xeber anî ji xweyîng
Dibê werin dawet e.

* * *

Dawet e xweş dawet e
Ji qurdan re rûmet e
Dawet şer e, şahînet.

* * *

Bê xweyî man gund, qelat
Gazî diqe ev welat
Dibê werin hewar e.

* * *

Bê qezî man qeç û bûq
Di rêlan de ba û pûq
Bê belg mane dar devî.

* * *

Navno diqin qurdanî
Ne helîştin mêranî
Qurdinon rabin dawet e.

* * *

Herê lawo dawet e
Dawet e xweş dawet e
Bûqa te jî Qurdistan.

* * *

Qezîyên wê delal in
Çi nermoq û şepal in
Ber mekesê mede wan.

* * *

Dengê avê çi ziz e
Newal jê re eziz e
Welat ! welat ! welato !

* * *

Ji zozanan hat kuling
Xeber anî ji xweyîng
Dibê werin hewar e.

*Celadet Alî Bedir-Xan*

---

### Bizina Pîrê

Bîzina pîrê çû çolê
Lê da berf û bagerê.
Pîriq derqet ji malê.
Li bizina xwe digere
Hê ! hê ! ......
Bizina xwe digere
Surê pozê pîrê bir,
Pozê pîrê werimî;
Guran bizina pîrê xwar;
Pîrê li ser digirî
Way ! way !..... Li ser digirî.

Ji bona îrû me hevkas got, pêşdetir em dîsan ji Rêya — Teze behs biqin.

Em ji hevala xwe re rêyeqe xweş û dawîyeqe geş hevî diqin. Divêt qo her gav me hey ji hev hebit û gereq e qo em hevdu ser xebata hev serwext biqin.

*Hercqol Azizan*

# EDEBIYATI QURDÎ

—3—

Lewaney serewe be tewawetî derdeqewêt qe edebiyati qurdî edebiyatêqî arî ye,we bilinde, we berze ,we herweqû edebiyati zimanani arî kabila bo berzbûnewe we serqewtin. We her çende medeniyyet le qurdistanda bilaw bibêtewe ewende edebiyati qurdî serdeqewêt we berz debêt.

Ba nextê binorîn lew hezaran çiroqane qe qurdeqan helyan bestwe, we dayan nawe, be tewawetî biyan xwêninewe, lew deme dezanîn qe hîç ferkêq niye le beynî edebiyatiême, we edebiyati zimanêqi rojawa we lew de me bilindayî edebiyatman deselmênin.

Aya helbesti çîroqî ( Mem û Zîn ) çi ferkêkî heye legel helbesti çîroqî ( Jlyada )!!...

Aya ew helbestani çîroqîye qe imro le ewrûpa deybînîn çi ferkêqi heye legel helbesti çîroqîy îmro qe le qurdistanda bilaw bûwatewe!!...

Ewendey pê nawêt, her nextê binorîn lem çîroqey xwarewe we sirinci lê bideyn ew deme bilindayi edebiyati xoman têdegeyn.

Em helbesti çîroqîyey xwarewe le deşti herîrî rojhelati (Hewlêr)—qe heşi nawerastiye le soran bilaw bûwetewe. We lew nawe be [ şirî leşqirî ] benaw bange. Çunqe daneereqey nawî [ leşqirî ] bûwe. Lem çîroqe da basî ( Mîr Suleyman begi herîr ) deqat qe axremîn paşay emareti herîr bûwe. Em karemane çend salêq beramber turqan radewestêt, we hera deqat, le paşan deşqêt u degîrret u debrêt bo Estemûl legel leşqriy piyawî. Mîr Suleyman beg xuşqêqi zor ciwanî debêt qe nawî ( Xanzade Xatûn ) debêt. Leşqirî hezî lê deqat. Inca şewki serbexoyî le layêqewe we girpey hez lê qirdin le layêqi dîqewe agir le dili ber dedat. We dest deqate dananî em helbes'e ciwan u şîrîney xwarewe :

« Le wî dewrim denorî heta ewî zemanê, le wî zemanim denorî heta dewri kubad Xanê, le dewri Kubad xanim denorî heta dewri Xan Suleymanê, le dewri Xan Suleymanin denorî heta dewri Cum Cume sultanê, le dewri Cum Cume sultanim denorî heta dewri şahi Newşirewanê. Eqim ne dît weqû mîri herîr u herîr begiyan, le dîwani hîze romyan, helbistê be giranê. Ewroqe dadesubhaynê, çi modet nîne lo ewî axay, ewetanê be tenê maytewe le wilati xerîbiyan bebê Xudanê.

Ewroqe serê min dehêşe, dilê min ked hadi nabê leber giryan, eger emin rojim lê helatibû le hemû kedem u heft şaran, dedatin le geliy Amedî le geli Sûlakê, dedatin le serî herîr u herîr begiyan, dedatin le çemî Sûredê, le min xemliye be qulunqi sêwî we henarî we ewan mîrate dar hermêyan, hemû ales seherî, beyanî qomelêqi bulbulan,êqe şaloran, be çiriqe çiriqê le naw da deqin dad û fixanê. Eger le hîqewe beser bêne xwarê qomeliqi mehbûb û zerdiyan deyan gût: leşqerî !!.. Eger etu hezdeqey le xoşiyan kebûl naqey taliyan, bigere reweqi tûlan digel xêzanêqi tajiyan, herewe seri herîr û herîr begiyan biqe zewk û sefay ewan zerdiyan. Dênewe le qoli kesarê, besiq berdanê, xine lênanê çawreş qirdinê degel qaniyan arekêqi tinoqe be tinoqe deçorêtwe le gahî şare qezyan.

Ewroqe şayi yeq degerê le serî meydanê, têdaye ayşi Suleyman begî degel mîre medyanê, eger şireqi biqrî be pênc sed zêrî lê pêşra bidey le singi ewan zerdiyan. Le ber dilê min cezme çi nuqar naqe leber ilûd û meçîdî ewan take şayiyan, emin le paşaxê xom swar nabim leçi muanîneqan deber piştî xom ranaqem çi xenceran helnagirim çi nasiraniyan heldigirim

## Hawareq

Ji xweyîyê Haware, apê min ê dal Celadet Alî Bedir-Xan re:

[ornament] !

Min çend xeber ji bona Hawarê nivîsandine. Ji apê xwe hêvî diqim bi çaveqî kenc li wan mêze biqe.

Ez yeq ji wan qurdên piçûq im qo bi şev rûjan, bi rûj şevan dijmêrim û di dilê xwe de dibêjim: gelo Hawara me qûjan rûjê ê bê?

Rûjên postê bi me nas in. Di wan rûjan de em çavnêrîya wê diqin.

Rûja qo Hawarê ji postê distîmin, diqim bin paşila xwe û newêrim zû zû veqim. Ji ber qo qêfa ditina wê ji xwe jî didexisim. Hêdî, hêdî pişta wê vediqim li çermê wê dinêrim li têdexitîyên wê agah dibim û paşê diqevim nav rûpelên wê.

Hawar qanîyeqe zelal, ez meriveqi tihn im; piyan piyan jê vedixum, agirê dilê xwe pê vediqujênim.

Apo, tu nizanî Hawar bi me çikas xweş e, çikas delal û beha ye. Tu zanî çira apo? Ji lewra qo ev sê çar sal in ez di dibistana biyanîyan de dixwînim, hîn ez hi xwe ne hesîya bûm lê ev Hawara dilşewat ez dîn qirim. Şev û rûj dixwînim, bendên wê ji ber diqim, û disan jê têr nabim.

Ez û hevalên xwe em nav hev da şêwirîn. Belê herçî qo bi zmanê me heta nivîsandin ji me ra hêsanî ye, xwendina wê biqêf e. Qo me ew carqê xwend êdî ji bîra me naçe. Ma ji bona herqesî ji

---

qeşqolêqi derwêşan, postalêqi haciya'u deperimewe leberi estiryan, deçimewe naw kewme gelêqî lewan dasinyan. Ewroqe dade subhaynê çi model nîne, lo ewîaxay, ewetanê be tenê maytewe le wulati xerîbiyan, we nayêtewe ser ew mulq u dewletan, heta ebed u ebel ebediyan.

*Hevindê Sorî*

ne wisan e. Herê zmanê herqesî jê re şêrîn û hêsanî ye. Ji lewra her qes bi zmanê xwe dixwîne û dinivîsîne. Tinê em qurd di bistanên xelqî bi zmanê xelqî divwînin. Ma çira ji bona çêlîyên qurdan ji dibistanên cihê çênaqim qo em têde bi zmanê xwe bixwînin.

Tu zanî apo min çi qir. Ser vê yeqê ez rabûm û çûm cem bavê xwe û min jê ra got:

— Bavo tu çira min dişînî dibistana biyanîyan. Di wan dibistanan da zmanê Hawarê nîne. Ew zmanê qo zmanê min e, zmanê qurdmancî ye.

Bavê min hiniq seqinî serê xwe qir ber xwe, madê wî guhêrî, bi dengeqî giran, lê ziz, li min vegerand û got;

— Lawo xebera te ye. Divêt qo tu di dibistanên qurdan da bixwînî. Lê sed heyf û mixabin dibistanên qurdan hêj ne hatine pê. Belê, di çavên te dixwînim, tu dixwazi ji min bipirsî: «Ma çira heta niho dibistanên me çêneqirine?» Çeneqirine, ji ber qo herçî xwenda û zana rabûne şûna qo xidmeta miletê xwe biqin, xidmeta miletên dîn qirine. Zmanê miletên din pêş ve birine û yê xwe şûn ve hiştine.

Gava ji bavê xwe veketiyam, dilê min dişewitî ez geleq ber xwe diqetim. Ji xwe ra, ji milet û zmanê xwe ra, heyfa min dihat. Herê gotinên bavê min rast bûn, pêşiyên me ji milet û zmanê xwe ra guh ne dan. Ma îrû, îrû ji guh nadin.

Herê ez bala xwe didim, ji çend mezin û zanayan pêve, tuqes di Hawarê de hawar naqe, naye hawara Hawarê. Ez dibînim qo li wê meydana qo Hawar ji meletê qurd ra veqiriye tu qes hespê xwe najo ê. Belê tuqes naqeve tirad û meydanê.

Ez ji mezinên xwe dipirsim, we çira em anine dinyayê, Ji bona qo em bibin dil û xulamên xelqî? an em ji weq

# Bêrîya Welat

Ax . . . dilê min çikas bêrîya wê dûrîyê diqe, ! ! Wê dûrîya qo di nav wê de ezman bi rengeqî din heşîn e, stêr weq çavên delalan dibirikin,û çiya rawestiyane.

***

Bêdengîya rêlan, min diqişîne bin siha xwe. Dixwazim di bin çikilên berû, kizwan û qenêran de rûnim.,

***

Çikas bi dileqî şewitî, ez dixwazim guh bidim guşguşa pelên daran. Dixwazim herim ronahîya hêvê, bi ser zinar û ser serê çiyan de bibezim.

***

Tinê li wê derê, di wê spehîtî û delalîyê de, diqarim bidil biqenim.

*Dr. Qamiran Alî Bedir-Xan*

---

xelqî xudan rûmet û bişeref, û bi serê xwe bijîn. Heqe wan em ji bona xulamîyê anîne, xwezî ne anîyana u warên xwe qor bihiştina.

Apo ez ji te hêvî diqim bila ew mezinên ha li min megirin. Ma Hawar ne ji bona hawar û gazîyê ye. Ez jî di rûpelên Hawarê de hawar diqim.

Apo, te carqê di bendeqê de digot: «Qurd ji hev cuda dilopên baranê ne, cihê cihê tên dakurtandin. Qo gihane hev dibin lehî, lehîqe boş. Tuqes, tu tişt li ber wan niqare biseqine. Felata welatê me di rabûna vê lehîyê de ye. »

Belê apo, ew dilopên baranê em in, em qurdên piçûq. Divêt mezinên me, me bi dil û hişê qurdmancî bixwedî biqin, da qo em bigehin hev û bibin ew lehîya qo me bifilitîne û bigehîne mirazê me.

Paşî ez têm destên te apê min î delal.

*Wecdî Cemîl Paşa*

# Qurdeqî qiçiq

Hêvîyeqe Mezin

Di vê hejmara Hawarê de bendeq heye: « Hawareq » . Nivîsevanê wê Wecdî, ji mala Cemîl paşa, qurê Mihemed begî ye. Wecdî lawiqeqî sêzdehsalî ye.

Wecdî berî sê salan bi bav û mamên xwe ve hatiye Sûrîyê û îrû digel pismamên xwe di dibistanên Hesîçê de dixwîne. Weqê ez li Hesîçê bûm, Wecdî dihat niq min, me bi hev re xeber dida, ji min re çîroqa Rostemê-Qurd digot. Hej min diqir û weq mameqî xwe li min dinihêrt.

Wecdî heta îrû ji xwendevanên Hawarê bû, bi vê bendê bûye yeq ji nivisevanên wê.

Belê Wecdî bi salan qurdeqî qiçiq e lê ji bona dawîyê hêvîyeqe mezin e.

Çavê min Wecdî !

Eve, herweqî te dil qir, min jî wekê, benda te êxiste Hawarê û belav qir. Ji benda te re geleq qêfa min hat. Tu pê xeberdoxîya hemî hevsal û hogirên xwe diqî. Belê hevsal û hogirên te jî weq te difiqirin, êdin ew jî dixwazin her tiştî bi zmanê xwe hîn bibin û di dibistanên qurdan de bixwînin.

Ewle be qurê min, hêdî hêdî, birêve, ew jî dê çêbibin.

Heta hingî divêt hon bi xwendina Hawarê rind hînî zmanê xwe bibin.

Belê, xebra te ye; xwenda, zana û dewlemendên qurdan, herweqî divîya bû, welê ne hatine hawar û gazîya Hawarê. Lê me hêvî heye, ew mirovên cangiran jî hêdî hêdî ji çêrandin û mezinqirina ziqên xwe bigerin û herqes gora halê xwe, hin bi kelem, hin bi dirhavên xwe bêne hawara me. Lê em li hêvîya wan ne seqinîn û naseqinîn jî. Jî ber qo ji hezaran pêrewî re pêşreweq divêt.

Paşî, ez çavên te maç diqim, Xwedê te ji bav û miletê te re bihêle, qurê min î delal.

*Celadet Alî Bedir - Xan*

# Ala Qurdan

Ronahîya dil û çav ;
Diyarîya dê û bav ;
Pêsira wî roj û tav ,
Spehitîya ax û av.
Ala qurdan ser be ser
Sor û gewr e qesq û zer.

***

Kehremanê ceng û şer ;
Kiblegahê mê û ner ;
Cayegahê can û ser
Afitaba dar û ber
Ala qurdan ser be ser
Sor û gewr e qesq û zer.

***

Hêvîya xortan û mêr ,
Mihreba mizgeft û dêr
Şahê evd û şahê şêr
B'reng û bihn e zîv û zêr.
Ala qurdan ser be ser
Sor û gewr e qesq û zer.

*Dr. Qamiran A. Bedir-Xan*

# FERHENGOQ

( Mêvanxane )

Xanîyê qo mêvan û rêwîyan bi pere dihewînin. Weq odeyên gundên qurdmancî. Lê bi vê ferka qo odeyên me herwe ne, mêvanxane bi pere ne. bi frensizî ( Otêl ) dibêjin.

( Vêsihandin )

Rahet qirin. Xwe vêsihandin, xwe rahet qirin e.

( Belg )

Ji belgên daran pêve ji cil û girêdanê re jî têt gotin.

( Quta-qirin )

Xelas qirin, Kedandin.Me dersa xwe quta qir. Dersa ma quta bû.

( Agah )

Xeberdar, serwext. Ez agah bûm, ez xeberdar bûm.

( Xeberdox )

Ewê qo bi nav û navê çendeqên din, ber hemîyan ve dibêje. Xeberdoxî : xeberdox-bûn e.

# ELfAbêya Qurdî

8

Ji sebebên bingehî pêve qo yeq bi yeq hatine raveqirin , ber vê yeqê jî me nîşanqirina (ق)ê bi (K) û ya (ك) ê bi (Q) çê tir û rastir ditin .

C , Ç — Di destê me de (C) û (Ç) mane. Me ev ji bona nîşanqirina dengên( ج ) û (چ) hilanî bûn .

Gora eslê van herfan dengê (ج) ji (ç) bêtir bi (c) dihatnîşanqirin . Herweqî di latînîya qevn , di hal elisqa şeşa de , qo diqet pêsîya ( e , i , y , æ , œ ) dengê (چ) a me dida , mîna dengê (z) ya elmanî , weqî niho di pirsên jêrîn de : (Ceres, Cicero, centum, circus, Cyrus, Cæsar, cœtus, caremonia)

Digel vê hindê me ev herf ji pêsîya xwe veqir , dengê wê ê qevn da alî û em di warê kebaleyê de man . Ji ber qo kebale li destûra me a pêsin çêtir dihat û ji bona feda qirina wê destûrê çi fêde çi qoteqî hebû.

Di zmên de nisbeta wan ji hemû yeq e.

$C\frac{102}{33789}$ $Ç\frac{103}{33798}$ .

Di encamê de me dengê (ج) bi ( c ) û yê (چ) bi ( ç ) nîşan qirin

Li hire dixwazim tişteqî di çavên xwendevanan re biqim.

Ew dengê qo di elfabêya erebî de bi (چ) tête nîşan qirin di hin deweran Qurdistanê û di pirsinan de ne weq dengê xwe ê nas lê bi awaqî din têt bilêv qirin. Bi awaqî welê qo ser dengê ( z ) ya elmanî diçe.

**DENGDÊR**

Herweqî me berê ji goti bû dengdêrên qurdî di drêj an qin bûna degên xwe de serseqinî ne. Yanî denqdêreqe drêj tucaran qin nabe û ya qin drêj.

Di yûnanîya qevn de jî dengdêr holê bûn, dengdêreq geh qin geh drêj ne dihat xwendin. Tinê di yûnanîya qevn de dengdêrinen navîn jî hebûn qo di zmanê me de nînin. ( dûmahiq heye )

*Celadet Ali Bedir Xan*

Notices sur la littérature moeurs et coutumes Kurdes

8

# MEMÊ-ALAN

Le roi a eu encore une fois recours à son grand pére ( Nerîman ) qui entra et sans hésiter chez le monstre et commença à le caresser. Celui-ci se laissa faire et tout d'un coup devint un cheval domestique.

On le nomma ( Bozê-rewan ) et ( Nerîman ) raconta à son petit fils ce qu'il avait vu dans les livres à sonsujet.(Bozê-Bewan)était le cheval destiné à parcourir les plus grandes distances dans le plus cours laps de temps. Il pouvait faire le tour du monde dans quelques jours.

( Meme-Alan ) le monta et parcourut la ville parmi les applaudissements de ses sujets.

Le roi des( Alan) fit venir tous les célèbres selliers du pays, il mit à leur disposition tout le tresor royal,et leur ordonna de faire une selle modèle pour ( Bozê-rewan ) « et lui firent une selle que pendant le jour eclipsait le soleil et pendant la nuit la lune »

## DEUXIÈM EPISODE

### La rencontre de ( Zîn ) avec ( Nem )

Les trois filles du roi des fées survolérent le fleuve de ( Cizîr ) et se perchèrent sur les murs de ( Burca-Beleq ) de là elles glissérent au boudoir de ( Zîn ) où la jeune princesse dormait tranquillement.

Elles prononcèrent le nom de ( Singav ) soufflèrent sur ( Zîn ) et lui jettèrent un mouchoir sur les yeux.Tout d'un coup la respiration cessa ( Zîn ), elle devint immobile comme une morte.

La soeur ainée appela une suite de fées qui se chargèrent du lit de ( Zîn ) et l'enlevérent

A l'arrivée au palais de ( Mem ) on le trouva dans le même état d'imobilité que (Zin). On posa le lit de ( Zîn ) à coté de celui de ( Mem ). On découvrit le visage de ( Zîn ) et les trois soeurs se perchèrent sur les bords des fenêtres et contemplèrent les deux beautés.

Elles attendirent un peu, voyant qu'ils ne bougaient pas, elles leurs soufflèrent de nouveau (Mem) fut le premier à ouvrir ses yeux, il se dressa dans son lit sur ses genoux, ne savait comment expliquer la présence d'un autre lit auprès du sien. Il se leva, examina, porte et fenêtres, tout était bien clos, rien à soupçonner de ce coté. Il se mit de nouveau dans son lit, il tira la couverture sur sa tête et essaya de dormir, puisque ce qu'il voyait ne pouvait être qu'une vision. Mais le sommeil ne venait pas.

Il se leva de nouveau et s'appreocha du lit et enleva un bout de la couverture. Sa surprise fut plus grande qu'auparavant.Une jeune fille qu'on pouvait prendre pour morte reposait dans le lit.

( Mem ) retourna à son lit et pria le bon Dieu en disant : «O tout puissant! mes années n'ont commencé de marcher vers le chiffre quatorze que depuis quelques jours. Même les mouches mâles et femelles n'ont pas encore choisi les pans de mon manteau pour se rencontrer. Aie pitié de moi et comme tu as amené ce lit auprès de moi ramène le d'où il vient».

(Zîn) restait toujours immobile.Les trois colombes souflèrent de nouveau.

(Zîn) ouvrit. les yeux et constata la présence du lit de (Mem). Elle aussi ne savait comment expliquer la présence d'un lit dans sa propre chambre. Elle aussi, comme (Mem)examina porte et fenêtres.Tout étaient bien fermés et intacts.Elle remarqua aussi que les lanternes étaient doublées, au lieu de deux il y en avait quatre avec celle de (Mem).

( Zîn ) pensa à une trahison. Le méme jour elle était allée faire une excursion, un jeune homme épris d'elle en soudoyant les gardes s'était faufilé jusque dans son interieur.

(Zîn) prise d'effroi et de colère se dressa dans son lit et d'une voix énergique s'adressa à l'étranger : «Lo lo.....qui es-tu ? que cheches tu ici, dans mon intérieur, je ne me rappelle pas de t'avoir parlé, et invité. Si j'appelle ( Tacin, Çeqo,Gurgîn) viendront, te donneront à la bouche dévorante des épêee ciselées. Ne sais-tu pas qui je suis et où tu es ? ( à suivre )

*Djeladet Ꭺali Bedir-Khan*

Textes et Traductions :

## *Yelî Delal*

— 1 —

Yelî delal, delal . . . . . . . . . . . .
Delal . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .
De rabe emrê dilê min bi gorî
Sebra dilê min bê te naye delalo !

— 2 —

Yelî delal ! suwarê' me suwar bûne
Berên xwe dane w'alîyê rojbile da
Pêşîya selefê suwaran danî bû qûna
[ çiyayê Evdilezîz
Paşîya selefê suwaran danî bû qûna
[ girê di Qewqeb'da
Dê xwezî ji xêra Xwedê ra
W'ezê bibima bakeqî gulan û rêhanan
W'ezê biqetama destê lawiqê xwe da
De w'ezê rûjê sê caran banê
[ min biketa ber simbêlê reş da

— 3 —

Delalo destê min berde
Ziqaq û qolanê' gundê me teng û tarî ne
Şeytan û avanê' gundê me geleq in.
Şeytan û avanê' gundê me geleq in
Dibê hineq ji wan bi hênceta agirî
Sibê bênê bi ser halê min û te
[ de delalo !
Delal . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .
De rabe emrê dilê min bi gorî
Sebra dilê min bê te naye delalo !

— 4 —

Yelî delal, delalê mala bavê min di xewa
[ şêrîn de
W'ezê dil naqim ji xewa şêrîn raqim
De w' ezê herim sûqa Diyarbeqra şewitî
Ebaqî ji sorê besrawî ji qenarê delalê
[ bavê xwe de bînim delalo !
Serê sibehê pê daqim.

— 5 —

Yelî delal . . . . . . . . . . . . . . . . . .
Yelî delal, heçî cuhabeq ya xêrê
Ji qenarê delalê mala bavê min de ji
[ min re bînê
« — Sehet xweş »
« — Ya te jî »
W'ezê bidim ê ciwaniqa ber mehînê
We heqe pê kaîl ne be
W'ezê bidin ê sed û bîst qîs û zînetê
[ malê dinê
De heqe bi wan jî Kaîl nebê
Sed û bîst aşên mala bavê min hene
W'ezê bidm ê, li binê soniqê; Nisêbînê
Delal . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .
Emrê dilê min bi gorî
Sebra dilê min bê te naye delalo !

### TIRSIM EZ BIMIRIM

Tirsim ez bimirim dilo heyran
Li vê paîzê delalo
Li vê paîzê.

Tirba min çêqin dilo heyran
Li binîya gûzê delalo
Li binîya gûzê.

W'ezê ramûsim dilo heyran
Sê bisqê' di Kîzê hoyo
Sê bisqê' di Kîzê delalo
Sê bisqê' di Kîzê.

Tirsim ez bimirim dilo heyran
Li vê buharê hoyo !
Li vê buharê.

Tirba min çêqin dilo heyran
Li binîya darê hoyo
Li binîya darê delalo
Li binîya darê.

Ezê ramûsim dilo heyran
Sê bisqê' yarê hoyo
Sê bisqê' yarê delalo !
Sê bisqê' yarê.

## *O Mon Beau*

— 1 —

Yelî delal . . . . . . . . . . . . . . . . . .
Delal . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .
O lève toi, que la vie de mon cœur te soit
[ un tombeau
Mon cœur n'a pas de patience sans toi . . .

— 2 —

Yelî delal! Nos cavaliers sont en selle
Ils se dirigèrent vers l'est
Les détachements de l'avant bivouaquèrent
[ au pied du mont Abdoul—Aziz
L'arrière des détachements avaient bivou-
[ aqués au pied de la crète de Kawkab
Ah par la grâce de Dieu
Que je fusse un bouquet de roses et de basilics
Et que je tombe entre les mains de mon
[ garçon ( amoureux )
O que ma poitrine se brise, trois fois par
[ jour devant les moustaches noirs

— 3 —

Mon amour ! laisse moi la main
Les mechants et les malins de notre village
[ sont nombreux
Oui, les méchants et les malins de notre
[ village sont nombreux
Il est bien possible que quelques uns d'en-
[ tre eux , sous prétexte de feu
Viennent le matin de bonne heure nous
[ surprendre
Delal . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .
O lève toi, que la vie de mon cœur te soit
[ un tombeau

— 4 —

Yelî delal, le beau de la maison de mon père
[ est dans un doux sommeil
Mon cœur ne consent pas que je l'éveille de
[ ce doux sommeil
Que j'aille au marché du Diyarbekir, l'ardent
Pour que je lui apporte un aba' semblable
[aux abas rouges de basrawi
Pour que je l'en couvre vers le matin.

— 5 —

Yelî delal . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .
Yelî delal, à tout personne qui apportera une
[ bonne nouvelle
De la part du beau de la maison de mon père
Je lui donnerai la jument et au plus la pouliche
S'il n'est pas satisfait avec cela
Je lui donnerai les 120 bourses,les plus beaux
[ bijoux de ce monde
Si encore il ne se contente pas de ceux-ci
Il y a les 120 moulins de la maison de mon père
Je les lui donnerai, ceux-ci son en aval des
[ alluvions, à Noussebine
Delal. . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . . .
Que la vie de mon cœur te soit un tombeau
Mon cœur n'a pas de patience sans toi.

---

## J'AI PEUR QUE JE MOURRAI

J'ai peur que je mourrai, o ceur en extase !
Cet automne, delalo
Cet automne.

Qu'on prépare ma tombe, o ceur en extase!
Sous le noyer, delalo
Sous le noyer.

Oh, que j'embrasse, o ceur en extase
Les trois boucles de la fille hoyo
Les trois boucles de la fille,delalo
Les trois boucles de la fille.

J'ai peur que je mourrai, o cœur en extase !
Ce printemps, hoyo
Ce printemps delalo !
Ce printemps.

Qu'on prépare ma tombe, o cœur en extase!
Sous l'arbre, hoyo
Sous l'arbre, delalo
Sous l'arbre.

Oh, que j'embrasse, o ceur en extase
Les trois boucles de la bien-aimée, hoyo
Les trois boucles, delalo
Les trois boucles de la bien-aimée.

***

Il y a là haut deux chansons l'une, un chant d'amour et l'autre un chant de danse. Pour celui-ci, il n'y a besoin d'aucune explication; quant au chant d'amour, c'est un passage de (Delalê—Beriyê ) dont nous avons déja parlé dans le troisième numéro de notre revue; page : 11.Cette chanson qui a beaucoup d'expressions et d'images tout â fait propres à la langue Kurde et étrangères à la langue Française, n'a pu être traduite que d'une manière à exprimer le sens général. Par conséquent il importe de donner quelques explications pour le lecteur étranger.

Le mot ( delal ) que l'on peut à la rigueur traduire par le mot ( beau ) n'a pas d'éqivalant exacte en français.

Il signifie à la fois, beau, gentil, amoureux etc . . . aussi avons nous préféré le laisser sous sa forme Kurde dans la traduetion.

( Que la vie de mon cœur te soit un tombeau ) c'est une expression surtout usitée par les femmes Kurdes envers leurs maris ou

هرچی خوه ندا وزانا رابونه شونا کو خدمتا ملتی خوه بکن، خدمتا ملتین دن کرنه . زمانی ملتین دن بپشقه برنه و یی خوه شونقه هشتنه .

گاڤاژ باڤی خوه ڤقیتام ، دلی من دشوتی ، از گلك پرخوه دکتم . ژخوه را ، ژملت وزمانی خوه را حیفامن دهات .

هری گوتنین باڤی من راست بون ، پیشیین مه ژملت وزمانی خوه را گه ندان . ما ایرو ، ایرو ژی گه نادن .

هری از بالاخوه ددم ، ژچند مزن و زانا یان پیڤه ، تُ کس د هاواری دا هاوار ناکه ، نایه هاوارا هاواری . از دبینم کو ل وی میدا ناکو هاوار ژملتی کردرا ڤکریه تُ کس هسپی خوه ناژوئی . بلی تُ کس ناکڤه تراد ومیدانی .

از ژ مزنین خوه دپرسم ، وه چراأم آئینه دنیایی ؟ .
ژبونا کو ام بین دبل وخلامین خلکی آن أم ژی وك خلکی خدان رومت وب شرف وب سری خوه بژین . هکه وان أم ژبونا خلامی بی آئینه ، خوه زی‌نه آئیانا و وارین خوه کوربهشتانا .

آپو از ژته هیڤی دکم بلا أو مزنین ها ل من مگرن . ما هاوار نه ژبونا هاوار و گازی‌یی به . از ژی درو پلین هاواری دا هاوار دکم .

آپو ، ته جار کی د بند کی دا دگوت : « کرد ژهڤـ جدا دلو پین بارانی نه . جهی جهی تین داقر تاندن . کو گهانه هڤـ دبن لهی ، لهیکه بوش ، تُ کس ، تُ تشت ل بروان نکاره بسکنه ، فلاتا ولاتی مه د رابونا ڤی لهی‌یی‌دا یه . »

بلی آپو ، أو دلو پین بارانی أمن ، أم کردین پچوك . دڤیت مزنین مه ، مه ب دل وهشی کردمانجی ب خوه‌دی بکن‌دا کو ام بگهن هڤـ و بین أولهیا کو مه بفلتینه و بگهینه مرازی مه . پاشی أزنیم دستین ته آپی من ئی دلال .

حسچه : ۲۸ نباخ ۱۹۳۲

وهبی جمیل پاشا

leurs bien-aimés. Elle veut dire que je me sacrifie à toi et à chaque instant de la conversation elles leurs adressent la parole en disant ( ez gorí ), textuellement ( moi ton tombeau ) En somme c'est un terme de politesse comme le ( Kuss die Hand ) de Vienne. On trouve cette expression dans quelques chansons sous la forme ( ez gorîya serê te me ),( je suis le tombeau de ta tête ).

( Que ma poitrine se brise, trois fois par jour. . . .) veut dire, si je le voyais trois fois par jour pour souffrir devant la splendeur de sa beauté.

(Sous prétexte de chercher du feu).Dans les villages on a la coutume d'aller le chercher chez les voisins, là où se trouve encore un reste de feu dans la cheminée.

Elle fait des cadeaux à celui qui lui apporterait la bonne nouvelle, parceque le jeune cavalier est parti pour la guerre.

L'expression qui se répéte au cours de la chanson (la maison de mon pére) veut dire plutôt le foyer de mon pére et le mot ( mal ) que nous traduisons par maison correspond plutôt au mot anglais ( home )

Ces chansons ont été chantées par la cantatrice Kurde ( Meryem Hanim ) de la tribu ( pêjcinaran ) enregistrées par la compagnie ( Odeon ) sous numéro (35483 – 35484 )

Nous avons choisi ces chansons et indiqué le numéro du disque pour cette raison que la cantatrice Meryem hanim est parmi les cantatrices celle qui chante et prononce le plus nettement de façon que chaque mot soit bien saisi et entendu.Ceux des lecteurs qui s'y intéressent peuvent bien chercher le dit disque et comparer la chanson chantée avec les paroles dont le texte et la traduction viennent d'être présentees là-dessus.

A propos, nous croyons devoir ajouter, à titre d'éclaircissement, que dans la chanson enregistrée par la plaque, il y a deux mots, en dehors du texte de la chanson, prononcés par la chanteuse et par un auditeur. Le premier est prononcé par un auditeur, ( Sehet xweş ) et signifie : « Bonne Santé », et le second mot est la réponse de la chateuse (ya te ji) « Pareillement. » Chez les Kurdes, lorsque dans une réunion, il est chanté, il est d'habitude d'encoureger la personne qui chante par ces mots.

*Hereqel Azizan*

صاحب الامتیاز والمدیر المسئول

الامیر جلادت عالی بدرخان

# هاوار

ژخوبي بی هـاواری ، آپی من ئی دلال
جلادت عالي بدرخان را

آپو ! ...

من چند خبر ژ بونا هـاواری نڤیساندنه . ژ آپی خوه هیڤی دکم بِ چاڤکی قنج لِوان میزه بـکه .

از یان ژوان کردین پچوکم کو بِ شڤ روژان ، بِ روژ شڤان‌دژمیرن و دِ دلین خوه ده دبیژن : گلو هاوارا مه کوژان روژی ئی بی .

روژین پوستی بِ مه ناسن . دِوان روژان دا أم چاڤنیر یاوی د کن .

روژا کو هاواري ژ پوستی دستینم ، دکم بن پاشیلا خوه ونو یرم زوزو ڤـکم . ژ بر کو کیفـا دیتناوی ژخوه ژی ددخـم . هیدی هیدی پشتاوی ڤدکم لِ چرمێ وی‌دنیرم ، لِ تیده خستین وی آگاه دبم و پاشی د کڤم ناڤ رو پلین وی .

هاوار کانی یکه زلاله ، از مرڤکی تهنم ، پیان پیان ژی ڤدخوم ، آگری دلێ خوه پی ڤد کژینم .

آپو تُ نزانی هاوار بِ مه چقاس خوشه ، چقاس دلال وبهایه . تُ زانی چرا آپو ؟ ژلورا کو أڤ سی چارسالن از دِ دبستانا بیا نیان‌ده دخوینم ، هین از بِ خوه نه حسیا بوم ، لی أڤ هاوارا دلشوات از دین کرم . شڤ و روژ دخوینم ، بندین وی‌ژبر دکم و دیسان ژی تیر نابم .

از و هڤالین خوه أم ناڤ هڤدا سێورن . بلی هرچی کو بِ زمانی مه هاتە نڤیساندن ژ مه را هیسانی یه ، خوندناوی بِ کیفه . کومه أوجار کی‌خوەند ئیدی ژ بیرامەناچه .

ما ژ بونا هر کسی ژي نه وِسانه . هری زمانی هر کسی ژیرا شیرین وهیسانی یه . ژلورا هر کس بِ زمانی خوه دخوینه ودنڤیسینه . تی أم کرد دِ دبستانین خلکی بِ زمانی خلکی دخوینن . ما چرا ژ بونا چیلی بین کردان ژی‌دبستانین‌جهی‌چینا کن کوام تیداب زمانی خوه‌بخوینن .

تُ زاني آپو من چه کر . مرڤی یکی از رابوم ، چوم جم باڤی خوه ومن ژ یرا گوت :

— باڤو تُ‌چرامن‌دشینی دبستانا بیانییان . دِوان‌دبستانان دا زمانی هاواری نینه . أو زمانی کو زماني منه ، زمانی کردمانجی یه .

باڤی من هنك سکنی ، مری خوه کر برخوه ، مـادی وی گهیری ، بِ دنگکي گران لی زیز ، لِ من ڤگراندو گوت :

— لاوو خبراته یه . دڤیت کوتُ دِ بستانین کردان دا بخوینی . لی صد حیف ومخابن دبستانین کردان هیژ نه هاتنه پی . بلی ، دِ چاڤین ته دخوینم تُ دخوازی ژمن بپرسی ، «ما چرا حتا نهو دبستانین مه چینکرنه» چینکرنه ، ژبر کو

---

ده‌که‌ن دادو فغانی . اگرله هیکه وه به سه ر بینه خواری کومه لیکی مه‌حبوب‌وزه‌ردا یان ده‌یان گوت : له شکری!! اگر اتوحه‌زده که‌ی له‌خو شیان‌قه‌بول نا که‌ی تالیان ، بگره ره‌وه کی تولان‌ده گه لِ‌خیزانیکي تاژ یان ، هه‌روه‌سه‌ری هه ر یر و هه ر یر به گیان ، بکه زه‌وق و صفای أوان‌ز.ردیان . دینه وه له کولی قه ساری ، بسك به ردانی ، خه نه لی‌نانی ، چاو ره‌ش کیردنی ، ده گه ل کانیان ، عاره قه کي تنو که به‌تنو که ده‌چور یته وه‌له گیاهی شاه که‌زیان....

او رو که شاییك ده گه ری له سه‌ری میدانی . تیدابة عیشی سلیمان بگي ده گه ل میره‌مه دیانی ، اگر شـیره کی بـکری به پنج سه‌د زیری ، له پیش را بده‌ی له سنگی أوان زه ردیان . له به‌ر دلیمن جه زمه چي نون کار نا کاله به‌ر علودو مه چیدی اوان طـاقه شاییان ، أمن له پاش آغی خوم سو'ر نابم‌له چي موعه نبه کان ، ده به‌ر پشتی خوم رانا که‌م چی خه بجه ران ، هه ل نا گرم چي ناصرانیـان ، هه ل ده گرم که شکولیکی ده‌ر و یشان ، پوستالیکي حاجیـان ، ده په ریه وه له به‌ری استر یان ، ده چه‌وه ناو قومه گه لیکی له وان داسنیان . أو رو که داده صبحیني چی موده‌ت نینه لو اوی آغای ، أوه تانی به تني مایته‌وه له وولاتی غر یبیان ، ونابیته وه سه‌ر أو مولك و ده‌وله تان ، هه‌تا أبدو أبه‌ل أبدیان . »» .

**هڤری صوری**

# ادبیاتي كوردي ٣

له وانه ي سه ره وه به ته واوه تی دەردە كه و يت كه أدياتي كوردی أدياتيكي آری يه و بلنـده وبه رزه و هر و كو ادبياتی زيمانانی آری قابله بو بەرزبو نه وه و سه ر كه وتن · وهر چه نده مدنيت له كورد ستاندا بلاو بيته وه أوه نده أدياتی كوردی سەر ده كه و يت و به رز ده بيت · بانه ختی بنور ين لەو هه زاران چيروكانه كه كورده كان هه ليان به ستوه ودايان ناوه، به ته واوه تي بيان خوينينه وه ، له وده مه ده زانين كه هيچ فرقيك نيه له بەينی أدياتی ايمه و أدياتی زيمانيـكی روژآوا و لەو ده مه بلندايی أدياتمان ده سه لمينين ·

آيا هه لبەستی چيروكی ( مەم و زين ) چی فرقيكی هەيه له گه ل هه لبەستی چيروكی يونانی كون ( ايليادا ) !!··

آيا أو هه لبەستانی چيروكی يه كه ايرو له اور پا ديبينين چی فرقيكی هه يه له گه ل هه لبەستی چيروكی ی ايرو كه له كوردستاندا بلاو بوەته وه !!··

أوەندەی پی ناو يت، هەر نەختی بنورين لەم چيروكی خواره وه وسرنجی لی بدەن أو ده مه بلندايی أدياتی خومان تی ده گه ين ·

أم هه لبه ستی چيروكی يەی خواره وه له دەشتی حريری روژ هه لاتی ( هەولير ) — كه بەشی ناوه رستی يه له سوران — بلاو بوەته وه · وله وناوه به ( شعری لەشكری ) يه ناو بانگه · چونـكه دانه ره كەی ناوی ( له شـكری ) يوه · لەم چيروكه دا باسی ( ميرسليمان بگی حرير ) ده كات كه آخره مين پاشای أمارتی حرير بوه · أم قارمانه چەند ساليك بەرامبەر تور كان راده وەستيت وەرا ده كات، له پاشان ده شـكيت و ده گيرريت وده بر بت بو ( استانبول ) له گه ل ( له شـكری ) ی پياوي · مير سليمان بگ خوشكيكي زور جوانی ده بيت كه ناوی ( خانزاده خاتون ) ده بيت · له شـكری حه زی لی ده كات · انجا شوقی سه ربه خوبی له لا بيـكه وه و گير بەی حه زلی كيردين له لا يـكی دیـكه وه آ گر له دیلی بدر دەادت

# از كوريبا بانگی ته مه

هاوار هاوری كورده ده نـكوو گازی ولاته
مزگی نی ی خوناسی نه هاتين به دەنگی هاوار
كی ژو كور پير وجووان

هاوار هاته چی يايان دەشت و گوندپی لەرزان
بانگي آزادی كوردان يك بوونی خوشی دلان
كه وته ناو مال وخيزان

هردەم به دەمی هاوار پيك ده كوششو هاوار
هوشير ده بنا كوردان لادەبان شينـا ولات
از كوريبا بانگی ته مه

آ كره : ٢٨ حزيران ١٩٣٢

**ماموستا**

---

ودست دكاته دانانی أم هه لبەستەجوانو شيرينەی خوارەوە:

« له وی ده وريم دەنوری هەتا أوی زَمـانی ، له وی زَمانم ده نوري هەتا ده وری قباد خانی ، له ده وري قباد خانم ده نوری ده نوری هەتا ده وری خان سليانی ، له ده وری خان سليمانم ده نوری هەتا دەوری جم جمه سلطانی ، له دەوری جم جمه سلطانم ده نوری هەتا دەوری شـاهی نوشروانی · ابـكم نه دبت وكو ميری هرير و هرير به گيان، له ديواني حيزه روميان هه لبستی به گرانی · أو رو كه دادە صيحه بنی ، چی مودەت نينه لو أوی آغای ، أوه تاني به ته نی ما يسته وه له وولاتی غريبسان به بی خوەدانی أو رو كه سەری من ده هيشی ، دلی من قەد هـادي نابی له به ر گريان، اگر أمن روژم لی هەلاتبو له هه مو قه ده مو هه فت شاران ، دەداتن له گه لی ی آميدی له گەلی سولاقی، ده داتن له سه ری هرير و هرير به گيان ، ده داتن له چەمي سوره دی · لەمن خمليه به كولونـكي سيوی و هناری و اوان ميراته دار هه رميان· همو ءه لەسـه حری ، به يانی كومه ليـكی بلبلان ، ايـكه شالوران ، به چريكی له ناودا

## داوە

ژ زوزانان هات قلنك
خبرآنی ژ خوەینگ
دبی ورن داوتە
*
داوتە خوەش داوتە
ژ کردان رە رومتە
داوت شرە ، شاهیت
*
بی‌خوەبی‌مان گندکلات
گازی دکە اڤ ولات
دبی ورن هوارە
*
بی کزی‌مان کچ و بوك
د ریلان دە باو پوك
بی بلگ مانە دار دڤی
*
ناڤنو دکن کردانی
نە هلشتن میرانی
کردنون رابن داوتە
*
هری لاوو داوتە
داوتە خوەش داوتە
بوکاتە ژی کردستان
*
کزی‌بین وی‌دلالن
چە نرموك وشپالن
برمقسی مدە وان
*
دنگی آڤی چە زیزە
ڤوال ژیرە عزیزە
ولات ! ولات ! ولاتو
*
ژ زوزانان هات قلنگ
خبرآنی ژ خوە بینگ
دبی ورن هوارە .

جلادت عالی بدرخان

## ژ خانی را

*جبذر خبرکی کردواربنە*
*دکل رومی، احمد خانی*

خانی تو بسە بکە هواری
رابە تو بلڤ ژوی مزاری
بفکر تو ببین دیاری زبنی
صورە و کی کل همی ژخو بنی
دومان وگری ژخانمانان
چاوان دگهیتە آسمانان
فریاد وفغانی دخت وبوکان
زاری وهواری ڤان پچوکان
جورا ولد حرامی جنکیز
نە رز هشتنە نە باغ نە پاریز
ویران کرنە کلات و باژار
تالان کرنە مزارو بازار
جیکی زری ودلال ورندان
لی‌عرعرەهرچو بوم و کندان

**لی**

بی هیڤی مبە بنیر توجارك
کردین بشقاق ببین مبارك
أیروقە نمایە وان نفاقك
پیکڤە همی بونە أتفاقك
طاوسی وعیسوی مسلمان
ژسیواس حتا بکهیتەلوران
یك جان ودل و یك هوارن
بالجملە لگازی یی بکارن
شش سالە همی بخوین دبازن
آزادی وخوە بخوەیی دخوازن
یادی بمرین ویابژین میر
ڤت لائقە کرد بمینتە أیسیر

بایزید : ١٥ هزیران ١٩٣٢

بهمن زردشت

## هشیار ژامە

هاوار کردنو ! نکن نکن
رنجانیار ژبیر نکن
شڤ وروژی هون خونکن
میرانیا خوەون زیدە کن

هاوار کردنو نکن نکن
بکیتیاخو وندا نکن
ناموساخو پایمال نکن

هاوار کردنو أمە پرن
چاڤین مە کسی نابرن
ناخبتن پرخزانن
أم ب قانونان نزانن

هاوار کردنو بر لزینن
زاروکی خو بخوینن
ب قانونان بزانینن
بلکی دوزامە هلینن

هاوار کردنو نکن نکن
بزمانی نیار گال گال نکن
زمانی کردان هون فرە کن
کچ و بوکان پایمال نکن
***
هری لی هری لی هری لی زری یی
ازی نخوەشم نخوەشی‌ل تایی یو
براجیکی‌من‌داینن‌ل‌زوزانی‌میر گەمیری
لـ یر یلکیا برفی بو
بلکی کچو بوکی ایلارنگین بین‌هرن
سیرانگاهو
چلنك گورا من دستی خو بدە
بنسری من عڤدالی خدی یو
دوایی‌دوایی‌فلکامال‌شویتی‌خایینی‌مرانایی

دشتا مروچی : ١٤ تباخ ١٩٣٢

لاوی فندی

هلگره ، بیه میڤانخانێ . من دگك ل یکی کر :

— خورتو، هکه ڤالا یی ب من رەوره . خورتی کو من دگك لی کر بو ژ هڤالین خوه ڤقتیا داپی من حتا کو أم گهشتن : کانکی من دین ند کر . ل دکانی من جغار یك داوی ، مه دست ب آخافتنی کر .

— خورتو ، تُ خلکی کو دەی یی ؟

— أز خلام ، أز بدلیسی مه

لی زمانی وی نەزاری خلکی بدلیسی بو ، من گوت :

— ماچره دبێژی کو بدلیسی یی ، ژ زمانی ته کفشه کوتْ ژ دەرا میردینی یی

— بلی ، خبرانه راسته ، لی أز اصلی خوه دبێژم ، أز بدلیسی مه لی د مهاجری یی ده در کتمه و دِ دورا میردینی ده بِ خوه دی بومه ، برڤی یکی . . .

— کنگی هاتیی بیروتی ؟

— اڤ بوسالك وهن ، ماازخلام تْ ژِ کویی ؟

— دڤیت تْ ژی ، ژ زانی من بزانی

— گورا زمانی ته ، تْ ژی ولاتی بوطانی ، لی د ڤ باژاری ده ، تْ بوطی نینن

پیالکی ـکنی ، کفش بو کو دفکری ودِ بیرا خوه ده ل تشتکی دگرها . د پی ره رابو سرخوه ، هات دستی من و گوت :

— أزخلام ، ل سوچی من منیره ، من آنها تْ ناس کری . ژ خوه من بهستبو کو یك ژوه ل بیروتی یه ، من دل دکر از هرم زیارتاوی لی من فدی دکر ، خدی ژمن ره ل هڤ آنی

— بلی یك ژ مه لی بیروتی یه ، لی اونه ازم ، أو برایی منه ، از ل شامی رودنم

د پی ره از و خودی یی دکانی أم کتن بازارا کاغذا هاواری . ژ خوه ژ بونا کرینا کاغذا هاوا ی هاتبوم بیروتی .

من شغلی خوه کتا کر بو . کاغذ ب ریهسنی بهاتا ریکرن . نی کاغذا چرمی من بخوه ره ببرا . خورتی من چرمی هاواری کر پشتاخوه ومه داری .

أم چو بون دکانکه دن . من بِ خویی یی دکانی ره خبر ددا . کردمانجی من دِ کرچککی ده ل سر تتسکان رونشتی ل من دنیرت ود کنی . من ژی ب دڤکنکی ژ یره گوت :

— خورتو ، تە خیره ، چره دکنی ؟

— خیره ازخلام ، ژ کیفا خوه دکنم ، ژ کیفا کردمانجی یه ، ژ کیفا کردمانجیانه دکنم . بلی ل بیروتی کردمانج زهفن . ژ صبی حتا ایڤاری ام بِ کردمانجی خبر ددن . لی گاڤاژ دڤی نه دبهزم هیژ بیتر کیفا من ژ یره تی . آخ ازخلام تْ نزانی کردمانجی چقاس شیرینه .

— ناهری ، کردمانجی کنگی بویه شیرین ؟

— ب سری ته ئی عزیز ، تْ زمان ولك کردمانجی نه شیرینه . از ب ترکی رند نزانم ، لی من أو گلکی بهستیه . ل عراقی من عربی و انگلیزی گلك بهستنه . ل سوری یی هر رو ژ عربی و فرنسزی دبهزم ، از ڤان داتینم بر هڤ ودبینم کو شیرانیا زمانی کردمانجی د تُوان ده نینه ، لی چه فیده أو بِ کردمانجی نزانن

— مابزانیانا چه دبو ؟

— هنگی ژ کردمانجی یی پیڤه بِ تْ زمانان خبر نه ددان . . .

**جلادت عالی بدرخان**

سال ۱
هژمار ۸
دوشمب
۱۲ ايلون ۱۹۳۲

السنة ۱
العدد ۸
الاثنين
۱۲ ايلول ۱۹۳۲

# هاوار

كوڤارا كردى * مجلة كردية

## شيرانى يا زمانى كرداجى

وكى از گهشتم بيروتى روژ چو بو آڤا وسى ساعت ژ شڤى در باس بوبون ·

صبه تر ، برى نيڤرو ، ژ ميڤانخانى در كتم ، من دا كوچه و كولانان و گهشتم ميدانا برجى · دنيا گرم ، باشل ، بهنا مروڤ تنگ دبو دچكها · من خوه دا برسها قهوكى ، جانى خوه دڤيسهاند ·

برج ميدانكه فره ودر يژكى يه · د ناڤاوىده پار يزكى كچك لى سپهى هه يه · ب گيان ، بهنون وداران خملاندى يه · تيره آڤكه كچك دبهوره ود كڤه ناڤ بيرمكه تنك · اردا بيرمى ژ كڤرين شهكرى وبنڤشگون راخستى يه · رنگى آڤي تيده وندادبه · بيرم وك زڤيكه بنڤشين خويا دكه ·

ل سرى ميدانى ، سى كوچه يين مزن — ژ باكر ، ژ روژهلات ورروژ آڤا — خلكى باژير دتينن ولى درژ ينن ·

خلك دناڤ كوچه يان ده مينا روباران دهر كن · أڤ سى روبار بن كو د ميدانى ده دگهن هڤ ، دبن لهيكه بوش وخوه ددن بر پار يزى · د برجاغين پار يزى ده پاين لهى يى دشكين ولهى دبه د بره برك د برراستى وبرى دن د برچپى پار يزى ره دهر كه ، حتاپشتى سرايى ، پاشى دلو پين لهو يى ، بر ب بحرى ڤه ، ژ هڤ د كڤن و بلاڤ دبن ·

خلك دبرمن ره دبهورين · پيرو جوان ، ژن ومير ، دولمند و بلنگاز ؛ ژ هر ريزى ، ژ هر رايى ، ژهر نژادو ملتى · من أو ژ بلگ ، ديم و سرچاڤين وان ناس دكرن ·

جارنان شفقه كى گور ويحن ب شاشكه كى كسك دكتن هڤ ، كمكى صور د سر چار ككى ره دقلقى · ژنككه ز كزن ، وك دنكى گيردبو ود كت پشتا كچككه نارين و بژنزراڤ ·

أڤه ، پيخواسك ، كاشو بى حمدى خوه دستين خوه د مرهيت و ناڤكلين ڤان پيرك و كچكان ره دگرينه · من جانى خوه ڤيسهاندبو · رابوم ، كتم ناڤ وى لهى يى · ژ نشكى ڤه ، ژ كولانكى چند سرى يين ب كم ودستمال ل من در بون ·

— نه لو ! · · هى زو يه · · · ماچهان · · · دڤ ژى برده · حسو دگوت · · ناهرى · · گهمده · · ·

قت نه دهات بيراوان كو ازژى ب زمانى وان دزانم ، كو ازژى يك ژ وانم ·

ژخوه ژمن ره زلامك دڤيابو كوهومور بن من

# كتيبخانا هــاوارى

هژمار
١

## ريزانا الفابى با كردى

| | غروش سورى |
| --- | --- |
| بِ چرمى خملاندى | ١٢٫٥٠ |
| ب چرمى عادتى | ١٠ |

ژبونا درفه دڤيت حق پوستى ب سر بيت خستن



## اشتراكات مجموعة هــاوار

في سورية وتركية والعراق وبلاد العجم وبلاد القفقاس

| | | |
| --- | --- | --- |
| عن سنة واحدة | ٥٠٠ غروش سوري | — ١٠٠ فرنك |
| عن ستة شهور | ٣٠٠ غروش سوري | — ٦٠ فرنك |
| عن اربعة شهور | ٢٠٠ غروش سوري | — ٤٠ فرنك |

وفي غير هذه الأقطار

| | |
| --- | --- |
| عن سنة واحدة | ١٥٠ فرنك |
| عن ستة شهور | ٩٠ فرنك |
| عن اربعة شهور | ٦٠ فرنك |

المراسلات يجب ان تكون باسم صاحب الجريدة : دمشق – حارة الأكراد

سال ۱
هژمار ۸
وشمب
۱۲ ایلون ۱۹۳۲

# هاوار

بوی
السنة ۱
العدد ۸
الاثنين
۱۲ ايلول ۱۹۳۲

## كوڤارا كردی * مجلة كردية

### تيده خستيين كوڤاری



۱۳۵۱ ه مطبعة الترقي بدمشق ۱۹۳۲ م

SAL 1
HEJMAR 9
îu
30 Ilon 1932

# HAWAR

ANNÉE 1
NUMÉRO 9
VENDREDI
30 Septembre 1932

## Qovara Qurdî * Revue Kurde



TOFEQ JI QURDMANCÊN DEŞTA HESINAN

Çapxana Tereķî
ŞAM — 1932

# QITÊBXANA HAWARÊ

**HEJMAR**

**1**

## Rêzana Elfabêya Qurdî

**Notesur l'alphabet Kurde**

Bi çermê xemilandî 12,50 K. S.

Bi çermê adetî 10 K. S.

Ji bona derve divêt hekê postê bi ser bêt xistin.

---



---

## Abonnements

Pour la Syrie, la Turquie, la Perse l'Irak et les pays du Caucase:

| | |
|---|---|
| 1 an | 100 fr. |
| 6 mois | 60 fr. |
| 4 mois | 40 fr. |

Pour tous autres pays:

| | |
|---|---|
| 1 an | 150 fr. |
| 6 mois | 90 fr. |
| 4 mois | 60 fr. |

Adresser toute demande au directeur propriétaire: Emir D. A. Bedir-Khan

Damas: Quartier Kurde

## Qirîyarîya Qomelê

Ji bona Sûrîya, Tirqîya, Ecemistan, Irak û welatên kevkasê:

| | | |
|---|---|---|
| Salqî | 500 kirûş-sûrî | — 100 frenq |
| Şeşmehqî | 300 kirûş-sûrî | — 60 frenq |
| Çarmehqî | 200 kirûş-sûrî | — 40 frenq |

Ji bona welatên din:

| | |
|---|---|
| Salqî | 150 Frenq |
| Şeşmehqî | 90 Frenq |
| Çarmehqî | 60 Frenq |

Her tişt bi navê xweyî têne şandin:

Şam : Taxa Qurdan

SAL 1
HEJMAR 9
în
30 Ilon 1932

# HAWAR

ANNÉE 1
NUMÉRO 9
VENDREDI
30 Septembre 1932

Qovara Qurdî * Revue Kurde

## Welat, Welatînî û Al

Welat erdê bav û qaliqên me ye.

Welat ew der e qo, pêşiyên me li wê rabûne, ji bona avahiya wê xebitîne û li wê mirine.

Welat ew diyar e qo, em têde seqinîne û rûjeqê di nav axên wî de bêne veşartin.

Xelqê welateqî, welatiyên hev in. Borî, hal û dawiya wan bi hev re girêdane. Zmanê wan, girêdana wan, her hal û lebtên wan mîna hev in. Pêşiyên wan li rex hevdu rabûna, rûniştin û mirine.

Welatî bi Kencîya hev şa dibin, her xirabiya hev diqevin. Şîn û şahîneta wan yeq in.

Xelqê welateqî brayên hev, pismamên hev in.

Hergav bi hev re, dest bi dest, ji bona xweşî, avahî û azahiya welatê xwe dixebitin.

Qam û armanca wan yeq in.

Ji bona welatê xwe can û malên xwe didin der, xwînên xwe bêperwa dirijênin.

Herê dixebitin qo welatê wan meqevit bin destên miletên din.

Lê miletin hene qo welatê wan, bi awaqî, qetiye bin destên neyar û dijminan. Weq welatê miletê me, Welatê Qurdistanê

Ev miletên ha ji bona rizgarîya welatê xwe dixebitin.

Xebata wan ev e: Rûjeqê berê biyanîyan ji welatê xwe derînin û mîna miletên din biserxwe bibin, di nav hev de bi xweşî, û bi Kencî bijîn.

Herqes hej welatê xwe, hej welatîyên xwe diqe.

Hejqirina welêt di dilê me de hêvîneqe mezin û bilind e. Em pê xurt, zexm û canfeda ne. Jê re welatînî dibêjin.

Welatînî di hundirê me de agireqî mikedes e. Pêta wî agirî ji me re her tiştên welêt dide hez qirin. Ji lewre, di ber çavên me de ax, av, çiya deşt, dar û qevirên welatê me ji yên welatên din spehîtir, xweştir û şêrîntir in.

* * *

Her milet xweyîyê aleqê ye. Al nîşana milet û welêt e.

Tevayiya heyîna miletan di ala wan de civiyaye.

Al namûs, rûmet û bextê miletan e.

Zarowên her miletî ji bona bilindî û bikedrbûna ala xwe, bêperwa xwe didin quştin.

Ala her miletî jê re beba ye. Di cejn û şahînetan de kesr, seray, xanî û qûçeyan pê dixemilînin, di ber wê re diborin, silavan lê diqin, wê maç diqin, datînin ser serên xwe.

Alên miletên biserxwe, di ser qelat û bajarên wan re li pêl dibin, di rêveçûna leşqerî de diveqin pêşiyê.

Lê alên miletên dîl, weq ya miletê me, ji her derê biderqirî, lihevtewandî li ser dilê zarowên wan de bilandî ne.

Miletên dîl dixebitin, xwînên xw dirijênin qo biyanîyan ji welatên xwe biqewirînin û alên xwe li ser qelat û bajarên xwe ji nû ve daçiqînin.

Ala her miletî bi çend rengan û bi şiqleqî din e.

Ala qurdan, ji jor ber bi jêr ve, ser hev, sor, sipî û qesq e, di nava wê de roj diçirise.

# Melayê Gulê

Wexteqî li bajarê Hesenqêfê belengazeq hebû. Jineqe wî ji hebû. Navê jinqê Gulê bû.

Belengaz herûj mileq êzing dianî bajêr û difirot, dida bi Kirûşeqî, dudowan û rûja xwe pê derbas diqir.

Rûjeqê ji rûjan jina Kêzî û miftî çûne ser avê, qo cilên xwe bişon. Jina belengaz ji çû û ser wan re cilên xwe şuştin. Gava jina Kêzî û ya miftî çav li jina belengaz qirin qo ewê cilên xwe di ser wan re dişo, hema rabûn dest bi jiniqê û dijunan qirin. Drêj bûne, pora wê vedirûn, ji ber qo ava cilên wê a bikrêj bi ser wan de dihat.

Gula belengaz jî li wan teksîr neqir, û paşê pol poşman cilqên xwe tev qirin û desî bi girî qir, çû mala xwe bal hewalê xwe ji mêrê xwe re got.

Mêriq jî got:

—Hermet ez belengaz im û ew Kazî û miftîyê bajêr in, ma ezê çi biqim, sixêf û lêdana te ji wan re ma.

—Nabît, ez li tu cihan rûnanim, yan tu ê bibî mela, yan tu ê min berdî, yeqê ji her duwan ji xwe re bigre.

—Hermet, ez ne bi xwendinê dizanin, ne diqarim li pêşîya du camêran nimêj biqim, ez dê çawan bibim mela. Ez hêvî ji te diqim tu bela xwe ji min veqe, ez qêrî vî işî nayim.

Qir ne qir bela jiniqê ji xwe veniqir. Heben mêriq rabû ser xwe, çû sûqê şaşeqe xwe peyda qir û çû ser pira bajêr seqinî. Deftera xwe bi destê xwe re girt.

Pireqeq hat serê pirê, qo belengaz dît jê pirsî:

—Mela tu çi işî li vir diqî?

—Ez nivişta çêdiqim, pîreqa qo mêrê wê hej wê neqe ez diqarim biqim qo jê hez biqe.

Jiniqê got: Mela ez di bextê te me, mêrê min hej min naqe, qo tu careqe min biqî hema tu çi bixwazî, ez ji te re seqinî me.

Sitileq mast jî bi jiniqê re heye. Melê got jiniqê:

—Vê sitila mêst û mê idîqî bide min ezê nivîşteqe te çêqim qo mêriq hej te biqe.

Jiniqê rabû, mast û mecidîq, da melê. Ji xwe rebenê melê nizane tişteqî binivîsîne, piçeq qaxez reş qir û li hev tewand da jiniqê û jê re got:

—Di nav qezîyê xwe de girêde

Jiniqê ji mêna melê jê re got wisa qir.

Ji ba Xwedê mêriq hej jiniqê qir, hejqirineqe zor. Xwedê ji melê re lihev anî, heçî qo tê niq melê jê re nivîşteqê çêdiqe, miraza wî tête cih.

Nav bi melê qet, Melayê Gulê holê, Melayê Gulê halo.

Teyreqî haqimê bajêr ji heye, li niq hêqim pir delal e. Rûjeqê teyrê wî winda bû. Çikas pirs qir ne qir pejna teyrê xwe ne qir.

Rûjeqê hineqan gotin:

—Ya haqim qo ne Melayê Gulê teyrê te derêne, êdin tu nema teyr dibînî, lê qo Melayê Gulê li qitêba xwe binihêre, ewê tavil derîne, heçqo xwendaqî pir xurt e.

Hêqim du xulam rêqirine pey melê. Bi rê de mela çav li teyrê hêqim diqeve, di nav çavê dareqê de. Mela jî deng naqe heta gihişt niq hêqim. Slav da hêqim, ewî jî slava wî vegerand, mela rûnişt, hêqim got:

—Mela xelq pir pesnê te dide qo tu xwendaqî pir xurt î, gelo rast e?

—Belê ezbenî

—Mela teyreqî min pir delal hebû, ev cend rûj in winda bûye, min divê tu teyrê min derênî·

—Bi saya Xwedê û ilmê ezê teyrê te derênim.

Careqê mela qitêba xwe veqir, pa Xwedê bide mela ne bê zane nê pê. Ma berê teyr ne dîtî bû. Li qitibê nihêrt û ji hêqim re got qo teyrê te li filan derê ye.

Xulam çûn, di wê derê de qo melê gotiye teyr dîtin û anîn.

---

Divêt zarowên Qurdistanê bixebitin û rûjeqe berê vê rojê hilînin, ber bi ezmanê Qurdistanê ve bilind biqin, li wê bibrûsqînin, welatê xwe ser avahîya xwe a pêşîn vegerînin û di bin tava wê re biserxwe û bi qamiranî bijîn.

*Celadet Alî Bedir - Xan*

Haqim ecebmayî ma, rabû ji melê re pênc zêr dan.

Melê perê xwe hilanîn, çû mal, gote pîreqa xwe :

—Hermet te ez qirim belaqê qo ez xelas nebim, îrû hal hewalê min ev bû li ba hêqim, lê hema Xwedê ji min re lihev anî. Êdin bela xwe jı min veqe, ezê ji vê melatîyê bigerim, melatîya bi derewan naçe serî.

—Ket ez kebûl naqim, tu ê mela bibî

Mela reben ma ser halê xwe.

Paş çend rûjan xişrên qeça hêqim winda bûn. Dîsan hêqim şand pey melê da qo xişrên qeça wî derêne.

Bivê nevê mela rabû, bi dileqî qul rahişt qitêba xwe û çû derîzana hêqim.

Hêqim digel jin û qeça xwe li eywanê rûniştiye. Mela slav li wan qir û qitêba xwe veqir. Lê hal ew hal e, mela tu tiştî nizane. Li qeçiqê dinihêre, dibîne qo Kuleq di derpêyê qeçiqê de heye. Mela jî li Kulê şakiz dimîne. Dawî, hêqim got :

—Mela tu çima wilo difiqirî û cuhab nadî ?

— Ezbenî, çikas ez li qitêbê dinihêrim fiqrê min li ser kulê ye.

Ser vê gotinê qeçiq rabû ser xwe û got :

—Nûqa hat bîra min, xişrên min di filan Kulê de ne.

Dîsan Xwedê ji melê re li hev anî. Hêqim deh zêr dane melê û qir berdevqê xwe.

Çend rûj borîn, sebeteqe hêqim tijî pere winda bû. Dîsan şandin pey melê. Hêqim jê re got :

—Mela hal, hewal ev e, tu çi dibêjî

—Ezbenî, min ji te divê, çil kaz, çil wekî birinc û çil rûj mihlet, bitifak ezê sebetê derînim .

Tiştên qo melê xwestin, hêqim jê re dan. Melê birinc û Kazên xwe hilanîn û çû mal. Qo xwedê jê re li hev ne anî mela qengê sebetê derêne. Çavê melê li wê bû qo her çil Kazî û bîrincî bixwe û ji xwe re baz de. Jina xwe re kewitî qir qo Kazeqê şerjêqe, wekîqî birinc têxe ziqê wê û zixureqî jî berde nav û biqe şiv.

Jiniqê nîna melê jê re got wisa qir. Bû êvar, Kaza xwe di nava xwe de danîn dest bi xwarinê qirin. Paş qo Kaza xwe xelas qirin, melê rahişt zixurê qo di ziqê Kazê de bû, avêt refiqê û got :

—Hermet tu ji bo Xwedê şehde be, yeq ji wan çû.

Dizên sebetê jî çil mirov in. Yeq ji wan tê ber quleqa xanîyê melê dihesisîne gelo mela çi biqit, sebetê derêne.

Ê diz gava gotina melê dibihîze di dilê xwe de dibêje : « mela em nas qirine » û baz dide. Mela bi xwe ji Kazê re dibêje.

Diz diçe hevalên xwe serwext diqe. Du sê rûjan ser hev tên ber quleqa xênî. Mela bi jina xwe ve Kazê dixwe, zixurî davêje refiqê û dibêje :

— Dudo ji wan çûn . . sisê ji wan çûn . . .

Diz Kail dibin qo mela bi wan hesiyaye, ji tirsa xwe sebetê ditînin niq melê û diqevin bextê melê .

Mela sebetê dibe û diçe niq hêqim. Hêqim sebetê vediqe, dibîne qo Kirûşeq jî jê winda ne bûye.

Haqim pir dilxweş bû, rahişt çil zêrî dan melê. Êdin zman ser zmanê melê re ne man, mela bû îmamê bajêr .

Rûjqe înê hêqim şand pey melê da qo li pêşîya wan nimêj biqe. Mela çû bihurt hundirê mizgeftê, li ber mihrabê ma seqinî, nezane bang bide ne jî Kamet biqe, ma heyirî, li dora xwe dinihêre nizane çi bêje. Hema carqê got şilb, li devê derî da û baz da. Hêqim û civata xwe çawan ev ditin dan pey melê derqetin derve . Qo paşiya wan ji mizgeftê xelas bû mizgeft derxunqî qet.

Weqê mela ev dît bihna xwe da û ji hêqim re got :

— Ezbenî min zanî bû mizgeft biqeve, ji lewre min baz da.

***

Haqim rabû xwe avêt ser destên melê û jê re got :

—Li dinyayê tişteq nîne qo tu nizanî, em hemî qoleyên te ne, herçî jî bixwazî ez ji te re seqinî me

Melê got :

— Ezbenî ezê tişteqî ji te bixwazim, min divê qo tu Kazî û miftîyê bajêr bispêrî min. Ji ber qo pir nekenc û fesad in.

Haqim rabû her du spartine melê. Melê jî bi vî qarî heyfa jina xwe ji Kazî û ji miftî hilanî.

*Cemîlê-Haco*

# Dilqoçerê !!

Cavên te xweş heşîn in
Çima bi xem bi şîn in
Dengê te nerm zelal e
Biqen' bi bêj' menale!
Rêl ez im tu bihn û reng
Dilqoçerê b' nav û deng.

Delala min tu naz î
Dengşîrîn î bi saz î
Bi çavên te dinê geş
Sînga te gul, gulîreş.
Rêl ez im, tu bihn û reng
Dilqoçerê b' nav û deng.

Tu aheng î b'lûr î
Tu alûs î bi nûr î
Ez dil im tu germî yî
Xurt ez im, tu nermî yî.
Rêl ez im, tu bihn û reng
Dilqoçerê b'nav û deng.

Ez Gulan im tu gul î
Tu ahengê bilbil î
Ez birîn im, tu derman
Ez Kurban im ez beyran.
Rêl ez im tu bihn û reng
Dilqoçerê b'nav û deng.

eşta dil de aşq tu î
Hişê min re basq tu î
Çavên te xweş heşîn in
Çima bi xem bi şîn in?
Rêl ez im tu bihn û reng
Dilqoçerê b'nav û deng.

Salên te hê ne hejde
Di refê spehîyan de
Dotmîr î, bûyî sereq
Xulamê te me bê şeq.
Rêl ez im tu bihn û reng
Dilqoçerê b'nav û deng.

Tu dotmîr î û mîr î
Şehyane yî bi jîr î
Dengê te nerm zelal e
iqen' bibej' menale!
Rêl ez im tu bihn û reng
Dilqoçerê b'nav û deng.

*Dr. Qamiran A. Bedir-Xan*

# Qurdistan

Êvar e
Pir sar e
Çol e, gir û çiyan bê dar in
Tarî ye
Zarî ye
Bê te dil û can birîndar in.

Welat e
Şewat e
Hêstirên min diqevin,çem e,
Dilê min
Dilê min
Êdî were delalê !!! dem e.

Mamiz î
Bi saz î
Qanîya stêr bû dilê min,mir
Hejqirin
Tum birîn
Xwelî bûn ne ma pêt û agir.

Adar e
Hawar e
Camêr tev dimeşin,bê Al in.
Stran û deng
Gul bê reng
D'mehdiqan de zaro dinal in.

Gir û ber
Krên û şer
Top û tifing diricifin .. Ah!!
Ax û dar
Gî Xwîndar
Ne mîreq ma ne siltan û şah!

Qel û gund
Cihên qund
Jin û qeç burc û kesr gî qêmbext
Li gorinan
Berazan
Bûq ji mir,ne ma serîr û text.

Talî reş
Bist û şeş
Lê dil ne mir ne bû ax û riji
Hêstir reş
Sîng, dil geş
Canên me gî camêrî tiji.

*Dr. Qamiran Alî Bedir-Xan*

# Mîr û Mar

Mîreq ye Cizîrê geleq xurt û dewlemend bû. Êxistesere xwe ji xelqê xwe re kenciqê biqe.

Zemicireq da avêtin ser pira bajêr, di ser nîvê wê re ji zengileqî fêris da hilavistin.

Mîr banqer di nav welêt de gerandin. Ewê qo biqare zengilî bibejîne, mîr miraza wî dê bîne cih.

Rûjqê Xelqê Cizîrê bi nimêna zengilî rabûn, ber bi pirê ve çûn qo bizanin qê zengil hejandiye.

Çi ditin. Şehmareq, xwe pêçandiye zengilî bi qerb û kehrê zingilî dihejîne.

Xelq lê qom bûn û dan ber kiran, da qo mar xwe jê veqe. Fêde ne qir, mar zengilî bêtir dihêjand.

Xeber gihandine mîr. Mîr wezîrên xwe hinartin pey qo mar here balê. Mar da dûv wezîran û çû xafa mîr. Serê xwe dahiland qir erdê û paşê hilda, devê xwe ber bi ezmanî ve veqir.

Mîr ji wezîren xwe pirsîyar qir, gelo daxwaza mer çi ye.

Di qoma wezîran de wezîreqî qarnas û şehraza hebû, got:

—Ezbenî, mar qiriye tişteqî daxwe, niqari bû, nêçira widi gewrîya wî de maye.

Li devê mêr fedqirîn, strowên marqî xuya diqir. Xerateq anîn, stro birîn û mar filitandin.Mar da rê û çû.

Sibetir mar di hewşa burcê de xuya qir.Bi devê xwe ve hûşîyeqî zêrîn hildigirt.

# TOFEQ JI QURDMANCÊN DEŞTA HESINAN



# Groupe des Kurdes de la vallée de Hesinan

La valleé de Hesinan fait partie de Botan et porte le nom de la tribu botanienne qui l'habitait, les Hesinan, ce qui signifie « les fers ».

Le pays de Botan, pays très montagneux, possède quelques vallées qui lui fournissent tout espèce de denreés. La vallée de Hesinan, située dans la partie occiaentale du pays, se prolonge de l'ouest de Djezire vers le sud et contient le mont « Kara-Tschogh ». A la suite de la dernière délimatation de la frontière Turquo-Syrienne elle a été rattachée à la Syrie.

Les personnes qu'on voit sur cette photographie sont des Kurdes de ( Deşta-Hesinan ) formant une ronde pour la danse, et qui ont cessé de danser pendant la prise de vue. Dans le groupe on voit quelques femmes. D'ailleurs dans ces danses de ronde les groupes sont mixtes, un homme et une femme.

---

Tuqesi niqari bû mana vê ecebê bizane

Zmanê mêr geriya û ji mîr re got:

—Mîrê min meheyire, ev hûşîyê zerîn ji mêweqê tê qo di nav rezên te de şîn dibe. Di wextê pêşîyên te de ew mêw hergav holê hûşîyên zêrîn didan. Ji ber qo pêşîyên te bi xelqê xwe ve adil û mihrivan bûn, zilma xelqî ne diqirin.

Mîr ji mêr pirsî:

—Heqe ez ji bi xelqê xwe adil bibim ew mêw ji min re jî hûşîyên zêrîn nade

Mar serê xwe hêjand û got:

—No, ezbenî ew edaleta qo ji bona hûşiyên zêrîn tête çêqirin tu hûşîyan nayine

*Qocerê Botan*

# Ji mirovên qêm re

— Bi Zerdeşt ve —

Jiyîn qanîyeqe xwestinê ye. Lê, di wan doran de qo mirovên qêm digel paqijan vedixun, qanî bijehr in.

Ez hej her tiştên paqij diqim, lê niqarim devê mirovên qêm û tihnîya peyayên pîs bibînim.

Wan bi qêmayîyên xwe ava zelal jehradar qir.

Gava wan navê xeyalên xwe ên pîs qirin xwesteq û armanc axaftin jî jehradar bû.

Weqê wan dilên xwe ên şil û şeylo didin ser agirî, agir bêqêf dibe, diqeve reşîyê û dû dıqe.

Ekl û hiş bi xwe şayîya birikandinê dixin dûr û diqevin tarîyê.

Hin peyayên qo ji jiyiynê xwe dane paş, ew tinê ji miroven qêm xwe dûr dixistin.

Lewra qo ew ne dixwestin qanî û agir bi wan re par biqin.

Hinên din qo qetine çolê û bi heywanên quvî ezabê tihnîyê qişandin ne dixwestin bi hêştirvanên pîs li qevîya qanîyeqê rûnin.

Carina ji xwe re dipirsim.

—Ma jiyîn hewcedarî mirovên qêm û pêyayên pîs e ??

C ımêrin weq teyroq û badevê hatin û pê li kiriqa peyan qirin. Ewan dil diqirin devên qortalên pîs û bêşerm bigirin.

Brao !! ma dilxwaza te ne aveqe paqij û avîje û qaniyeqe zelale?

Hingî xwe bilind qe, di bilindayiyê de qanîyeqe zelal û paq heye, di dora wê de mirovên pîs û peyayên qêm rûnanin.

Di wê de agir bireng e, dû naqe, bi pêteqe sor diçirise.

Brayê nin!! dizanim qo tu pê qanîyeqê digerî,

Havîna dilê te wê honiqayiyê dixwaze.

Were, di wê de, bêdengîyeqe nerm heye, ew bilindayî hêlîn û welatê me ye.

Em hêlîna xwe li ser dara dawîyê ava biqin.

Eylo bi niqilên xwe ji me re zad dê bînin.

Belê, em tucaran destên xwe direjî xwarina qo mirovên qêm û peyayên pîs jê dixun, naqin.

Ew destên xwe ên bêşerm direjî xwarina me dê biqin û pê dev û zmanên xwe dê bişewitînin.

Em weq eylo weq berf û çiyan di rex bayê xurt de, dê bijin.

Emê carqê weq bayeqe zor bi mirovên pîs û peyayên qêm biqevin û bihna wan bigirin.

Brayê nin !! ji dijminên xwe re şiretan biqe ber bi bayî ve tif meqin.

*Dr. Qamiran A. Bedir-Xan*

# Qula Dil

Begê min, serwerê min ey Celabet
Şehê min, rêberê min pur edalet
Tu binivîse di Hawarê selavan
Ji ber min ve li qurdmancan temaman
Çi qurdmancên Enadol û çi sûrî
Çi loran û çi gewran û çi sorî
Çi gavan û çi sapan û çi mîr e
Geleq behtir li qurdmancên Cizîr e
Ji Nafiz beg bipirse ey begê min
Çi derman e, ji bo derdê dilê min
Birîndar e, ji ber daxa welat e
Gelo derman heye jê re, li ba te
Belê îsa ji ezman hate xwar e
Welê dîsa ne di jê re tu çare
Bi ser sînga me danî destê taze
Di rengê ayînê dî dil ne saz e
Diqir Kîrîn digo derdê evîn e
Ev e, derdê li Ferhad û Şirîn e
Ev e, derdê qo pê çune Mem û Zîn
Tu dê bimrî bi vî derdî Cegerxwîn.

*Cegerxwînê Qurdî*

Vê paşîyê Cegerxwînê me ê xweşewîst û hêja ji me re çend bend û xweşxwan rêqirine. Ji ber qo ev hejmara ha tijî bû bû me ji xweşxwana jorîn pêve tuwên din niqari bû belav biqin. Qo Xwedê hez qir di hejmara deha de emê çendeqan pîşqeşî xwendevanên xwe biqin.

# Ez û Ħawar

Weq piranîya qurdên qo di welatên biyanîyan de radibin û ji bona xwendinê ji malên xwe jî dûr diqevin, min jî zmanê xwe rind nizanî bû.

Piştî kedandina xwendina xwe nezanîya zmanê min li min ji berê girantir dihat. Min dil diqir rind hînî zmanê xwe bibim. Hawar bat hawar û gazîya min. û ji min re bû mamhoste. Ji lewre çikas pesnê wê bidim jî dîsan niqarim bêm ber kencîya wê.

Nivîsandina Hawarê bi herfên di nû geleq baş e. Ji ber qo zmanê me, zmanê qurdî zmaneqî Arî, Hindo-Ewropî ye û tinê bi herfên miletên arîzman rast û kenc têt nivîsandin.

Ji bona qo ez biqarim ramana xwe çêtir raveqim divêt birhaneqe wî nîşanî xwendevanên Hawarê biqim.

Weqî nibo, berî derqetina hawarê mamhosta min pîriqa min bû. Hingî min zmanê xwe bi herfên erebî dinivîsandin. Lê sibetir herçî qo min berî rûjqê nivîsandi bû, min niqari bû ez bixwînim û weqe xwe bilêv biqim. Ser vê yeqê min dev ji herfên erebî berda û ji xwe re bi herfên latînî elfabêyeq çêqir. Êdin bi elfabêya xwe min her tişt kenc dinivîsand û rast dixwend.

Gava hawar derqet min elfabêya xwe û ya hawarê danî ber hev û dît qo her du elfabê geleq nizingî hev in. Ne gereq e qo ez bibêjim, ev nîzingayî ez geleq şa û qêfxweş qirim.

Par çû bûm Qurdistana jêrin. Li Bexdayê min Tewfîk Wehbî beg dît. Ew jî bi elfabêqê mijûl dibû. Lê berîya wê elfabêya hawarê derqet û me da pey.

Li Silêmanîyê di Civata Zanistîyê de min çend xortên xwenda nas qirin. Bi tevayî digotin qo zmanê me tinê bi herfên latînî tête nivîsandin û ne bi hinên din. Herweqî îrû jî em dinivîsînin.

Lê divêt herçî xwenda û zanayên qurdan hene pişt bidin me û elfabêya me belav biqin, bi xwe hîn bibin û ji xortên nûgiha re hîn biqin.

*Elî Seydo*

# ELfAbêya Qurdî

**9**

Dengdêrên qin ev in : e, i, u,
Dengdêrên drêj ev in : a, ê, î, o, û.

A. O- Ev du dengdêrên ha di zmanê me de jî weq yên zmanên din tenê bilêv qirin, lê hergav drêj in û tucar qin na bin.

Weqo :

A — çaq, dar, paq, bar.

O — zor, gol, lor.

Tinê di zarê nîvro de carinan weq (eu) ya frensizî û ( ö ) ya tirqî tête xwendin. Hingî bi danîna du dekan li ser ( o ) ye tête nîşan qirin : qöl, göl.

Ê — Gava me sehîtîya denganîya qurdî diqir em rastî dengeqî batin qo nîzingî ( فتحهٔ ثقيله ) yê erebî ye.

Ev qengê ha qo di cara pêşin de li ( a ) yeqe qin dimîne di rastîyê de ne ( a ) yeqe qin e, û niqare bibe jî. Ji ber qo di zmên de ( a ) ya drêj heye û qina wê niqare bebe.

Di encamê de xuya bû qo ev dengê ha ji( e ) qe stûr pêvene tu deng e. Belê ev dengê ha ( e ) qe welê ye qo stûr têtê xwendin û herçî dengdarên qo didêre stûr dide xwendin.

Ev dengê dengdêrî tinê di hin dewerên Qurdistanê de têtê bibistin, ne di hemî deran de.

Hebû qo em vî dengî bi danîna du dekan liser ( e ) nîşan biqin. Ħerweqî (e) yên pirsên ( pëz ) û ( sëd ) qo bi herfên erebî bi ( ظ ) û ( ص ) weq ( پظ ) û ( صد) dihatin nivîsandin û dengdarên wan stûr dihatin xwendin.

Ji hêla din ev ferka bilêvqirinê di hin pirsên erebî de qo qetine hundirê Zmanî tête dîtin

| esqer | ereb | elî |
|---|---|---|
| ësqer | ëreb | ëlî |

( dûmahiq heye )

*Celadet Alî Bedir - Xan*

**Notices sur la littérature mecourses et coutumes Kurdes**

9

# MEMÊ-ALAN

« Ce pays c'est le pays de (Cizira-Botan) domaine des princes, des chevaliers et des hommes braves. On m'appelle ( Zîna-Zêdan ) la fille du prince[ Zengîn ] la sœur du prince [ Ezîn ] la cousine des trois [ Mêrquj ] tueurs d'hommes,[ Kelenda ] la dote payée du prince [ Çeqo ] La possesseuse de [ 41 ]esclaves,aux ceintures dorées et brillantées. Ce palais est [ Burca-Beleq] le palais d'hiver des Emirs de [ Azîzan ]. ( 1 ) Au nom du créateur je suis capable d'affronter le scandale et expédier ta maison sur les ailes ingrates de l'univers [ feleq ]. Homme perdu, mon âmé n'est pas du vent, assez, ne penètre plus dans les asiles étrangers sans le consentement des proptiétaires, allons va-t-en »

Mem ne pouvait plus se tenir, il se leva sur ses genoux et cria :

« Canemergê,qulpêqetêl que me racontes tu ? le pays que tu nommes [Gizîra-Botan] sa forme est étrangère à mes yeux et le son de son nom est inconnu à mes oreilles. Nous sommes dans le pays ( mexribî ) Le palais où nous sommes c'est le chateau fort « Burca-Qesqesor » « chateau-arc-en-ciel » qui de chaque point une novelle couleur jaillit. C'es la résidence des princes des « Alan ». Qu'est-ce que c'est Burca-Beleq où se trouve-t-il qui l'a-t-il bati ? La capital du pays Mexribî repose sur sept côlines, posséde 360 quartiers. C'est la mer qui prend soin d'elle, pendant que le soleil est couché elle lui jette ses écumes blanches montées aux ondes dorées de viollettes . »

Il donne une longue description, il parle de sa garde royale, tout des jeunes garçons de la grande noblesse chacun capable de compter par cœur 7 . . . 17 . . . 27 . . . aieux et il ajoute :

« Rêvindayê . . . . route perdu, lève toi, tu vois que ce chateau n'est plus ce que tu appelles Burca-beleq tu n'es pas chez toi, tu es chez moi qui n'admets pas ta présence. Tu vois bien, tu t'es trompé, tu devais aller chez quelqu'un qui t'attendait, va chez lui, prends tes chandelles et va les poser au sommet du lit, de ton amant pour éclaircir son visage noirci du fait de t'avoir detourner . . . »

( Zîn ) proteste énergiquement et répète qu'elle se trouve chez elle à(Burca-Beleq). ( Mem ) commence à rire, il lui propse de descendre au rez-de-chaussé et d'examiner le palais pour la convaincre qu'elle n'est pas chez elle et qu'elle se trompe.

( Zîn ) consent, mais ( Mem ) trouve un autre moyen pour éclaircir le malentendu. Il lui propose que chacun à son tour appelle ses esclaves, et ses gardes.

Zîn consent et elle appelle: « Rêhan , Rêhan où es-tu viens . . (xwelîserê) viens . . . est-ce ainsi que tu executes mes ordres, tu ne devais paz laisser même le vent pénétrer chez moi sans que je t'ai autorisé ».

Elle appelle plusieurs fois,aucune réponse.

Mem à son tour fait appel à ses gardes. Le chef ( Bengî ) suivi d'une quantité de jeunes hommes qui montaient la garde apparait au seuil de la porte et dit :

« Ordonne mon prince que j'envoie la ville tout entière à la bouche rouge de l'enfer»

( Zîn ) s'oblige à s'avouer vaincue.Elle demande pardon. ( Bengî ) les quitte. ( Zîn ) et ( Mem ) se renconcilient ( Mem ) dit à ( Zîn ) :

—Nous devons attendre jusqu'au lever du soleil pour savoir si tout ceci n'est pas un rêve et si cela c'est de la vérité. J'informerai mon grand père maternel ( Nerîman ) qui nous unira pour toute la vie .

Comme souvenir et pour pouvoir plus tard examiner la vérité de l'evènement ils changent leurs bagues.

La bague de ( Mem ) portait l'insigne : ( Mirê walatê Mexribî ) et celle de (Zîn) (Dotmîra mala Azîzan ) Princesse de la maison des Azizan. ( à suivre )

1 - ( Zîn ) prenait la chambre de Memê Alan pour sa chambre. Le palais de Mem était une réplique de Burca-Beleq jusque dans ses moindres détaitls. Ainsi que l'ameublement de chaque chambre.

«Ils tombèrent dans un sommeil lourd, qu'on aurait pu penser qu'ils ne s'évellleraient jamais, mêm si le dernier jour du monde arrivait et si le ciel leur tombait dessus ).

Les trois colombes sœurs résolurent d'amener Zin chez elle avant l'aube : elles enlevèrent donc son lit, et, survolant les déserts et les montagnes, traversant les brouillards et les nuages, frôlant les ombres de la lune, elles parvinrent à la capitale de Botan et déposèrent le lit de Zîn dans son boudoir.

***

Le lendemain, Zîn n'ouvrit les yeux que vers midi; elle chercha le jeune homme de la nuit, et elle ne trouva personne. Mais si l'homme avait disparu, une flamme d'amour restait au cœur de Zîn.

Elle se demanda un instant s'il ne s'agissait point d'un de ces rêves que les jeunes filles ont coutume de faire. Mais la bague de Mem était là pour attester la réalité de l'aventure nocturne. ( Oui, s'écria-t-elle, c'était bien vrai, ce n'était pas un rêve : la lune de Cizîr avait touché le soleil couchant ). Et elle se mit à pleurer, à gémir ét à pousser des cris.

Ses esclaves se précipitérent auprés d'elle. Mais, n'osant rien lui dire, elles se contentèrent d'informer l'Emir, qui vint aussitot.

« Au vert des yeux et au rose des joues, mîr ( Azîzan ) vit tout de suite que c'était un mal terrible : le vert des yeux, flétri par l'automne, avait jauni ; les joues roses, leur lumière éteinte, n'étaient que des plumes ternes et sans vie.»

Il convoqua toutes les autorités médicales ; mais Zîn ne voulait de personne, et elle disait à son frère : « Mon aîné, je n'ai ni blessure ni maladie : Tranquillise-toi donc » . Puis, décrétant un deuil de six mois elle fit savoir que pendant cette période elle ne recevrait personne et resterait toute seule chez elle.

Car, en elle-même, elle se disait qu'entretemps . Mem donnerait signe de vie.

( à suivre )

*Djeladet Aali Bedir-Khan*

# L'Alphabet Qurde

8

Dans la premiè e forme la disparition n'est pas complète. Il n'est agi d'un amalgame de « wi », s'est tellment fortifié que le « i » l'a emporté sur le « w » qu'il a fait disparaître pour rester seul.

suwar , swiwar , siwar
şuştin , şwiştin , şiştin

Dans la seconde forme le « u » disparait en même temps que la consonne qui le suit , la voyelle longue « o » apparaît à sa place et compense la disparition du son consonnique.

cuht cot
suhtin sotin

Le « u » entraîne quelquefois dans sa chute d'autres lettres différentes, voire même des voyelles.

bihurin borîn

La forme seconde, c'est-à-dire «borîn » donne également des dérivés.

Par exemple, le transitif de « bihurin » est « bihurtin » ; après la stabilisation de « borîn » on lui a donné un transitif d'après la règle qui veut qu'on ajoute au radical du verbe intransitif la terminaison « andin ».

borîn borandin

Ces sons existaient également dans la langue persane. En particulier, malgré le déclin de la prononciation la dictée du « xw » a persisté jusqu'à nos jours :

xwaher خواهر
xweş خوش
xwasten خواستن
xwace خواجه

L'auteur d'une grammaire persane ( رهنمای فارسی ) note bien ces points, mais d'une manière vague et imparfaite. Il dit textuellement : « Dans la langue persane on trouve encore deux lettres qui peuvent être figurées par ( خو ) et ( قو ) surmontés de trois points ,et que l'on prononce encore au Kurdistan, au Khouzistan et à Chiraz.»

( à suivre )

## مارشا کردي

گلی بران ورن جنگی
بشوئين دل ژڤی ژنگی
بيژم أز حتا کنگی
نهن يك ژمه بڤی دنگی

هاوار هيه ام چبکن
ورن دا أم خوه کار بکن
کاری ل چێن کار بکن
داهون ژخوه‌ره کيف بکن

گلی بران بگرن گوڤند
بگرن جيکی دلال ورند
بن پنج بکن و کی أسد
دی ژوه بخوازن هر مدد

کيف وخوه‌شی هر پی وه به
هون ڤی بزانن هر وه به
أڤ ولات وجکی وه به
ژ بيانيان ره بی فيده به

هون چه‌بکن بی لومه به
چاڤ نيرين ام لدستی وه‌به
بزانن اڤ شانی وه به
والله و بالله اڤ وه به

أز کو کردم أز کردي مه
ژ جيکی خوه‌ره أز گوری مه
نه بی دوست و بی خوه‌ديه
گل آلابی لسری ديه

أز کو کردم دڤی بکم
أڤان بران ژخو رابکم
أز بدم شير وان کر بکم

باڤ و کالان پی صاغ بکم
باڤ وکالين مه پر باشن
لی ام دگل هڤ دلرشن
ايرو قوی ام نخوه شن
ماچو دکم چاڤين گشن

أز کردي بي شرنجی مه
خلامی ميری بوطی مه
هر وخت ژوانره گوريه
جلادت عالی بگی مه

أی بگ و أی ميرميروشاه
وك خرشيد عوزو باو ماه
هرن ژ مه‌ره پشت و پناه
دائيم ژ وه ره هر أالله .

**مصطفى أحمد بوطی**

---

ونشكر همته . كما إننا ننتظر من جميع قرائنا الافاضل بان يسألونا تفسير جميع المفردات المغمضة عليهم .

كومل — هذا اللفظ يطابق كلمة (مجموعة) باللغة العربية .

كوڤار — مجلة

لوری یا بدرخان — لوری : غناء تغنية الأم لتنوم ولدها ، اذن لوری یا بدرخان غناء من هذه الاغاني مختص ببدرخان .

بسر كاز برين — اسم مكان واقع في ضواحي ديرك .

دلدزی یا گلکی — دزی بمعنى السر أما ( دلدزی ) تأتي بمعنى سر القلب . ولفظة ( گلكی ) عبارة من وردة . فاصبح التركيت يفيد بمعنى : سر قلب الوردة ،

پيروزي يا هاواری — پيروز بمعنى التهنئة والتركيب ، بمعنى تهنئة هاوار . مثال على ذلك : ( جژناته پيروز به ) أي عيدك مهنأ . هيسانی — هين . دشوار — صعب .

---

## زينه خهو

د رو پلا سسی یاده بر ڤی سرنامی شعرك هيه . تيده چند نراستين چاپی هنه . ام ژخوه يجی بی وی هيڤی د کن بلا ل مه مگرت ژ برکو ام ب زاری بابا کردی رند نزانن ، لی ام ژی و ژخوه ندڤانين مه ئين دن هيڤی د کن بلا بدو شعرين خوه بخطکی رند ، گر و پرسان ژدڤ ڤقتاندي نيڤيسينن دا کو ام بکارن رند وراست بخوينن و بند و شعر ين وان بی خلط در ينن . نراستين زينه خهو أڤن ، زينه خهو — زينه خهو . لالايه شندی — لالايه شنه‌ی . آده رو ابزد — آذهر وايزد . له پاشی کرنوشی — له پاشی شی کرنوشی .

**هاوار**

---

## الى قرائنا الكرام بالعراق

نظراً لما يحدث من الاختلاف في قيمة الاشتراكات في مجلة هاوار بسبب تطبيق نظام العملة العراقية الجديدة . نبادر الى أعلان قيمة الاشتراكات عن المدد المختلفة بالعملة العراقية كما يأتي :

| | فرنك | فلس |
|---|---|---|
| عن سنة واحدة | ١٠٠ | ١١٠٠ |
| عن ستة شهور | ٦٠ | ٦٩٠ |
| عن أربعة شهور | ٤٠ | ٤٦٠ |

ونرجو من القراء الكرام ان يرسلوا بدلات اشتراكهم بعنوان صاحب المجلة .

برلین چی یه وچی تیایه ؟ وەرن بگەرین بە دیهاتا بزانن لادبی کورد له چه حالیکدا به چون ئه ژی ؟ چند قوەتی به سەرە وبه ؟ ، چی اخوا ؟ بو وچ لاواز وهژاره ، کردستان چه نوعه معدنیکی تیایه ؟ وکی خو یبی کورد ئه مژی؟ ئەی لاوان ! ئەی مبشرانی سەر کەوتن و سەر به رزی ! بگەن یه فریای ملتا .

قاموسی کوردي : انقلاباتی زمانه ، عوارضی طبیعی زبانی کوردي شه قوپه ق کردوه ، هه ول بدەن قاموسیکی عام بکەن تانسلی آتی له یکتري بگەن . به خذمتکی گەورە بو عالمی کورد ئه کەن . هاو خو یته کانم .

د — لەش ساغی : ملته کان قدري لەشی ساغی کەم ازانی ، چونکی هرچي پاره یه کی هیه به دەسی چند اشخاصیکه وه و یه و مرشدیکی دلسوزی نه بوه کەفیري بکا یه صورتیکی فنی خوي دەرمان بکا . ملت فیري صحت بکەن . و پي بلین عصري ٢٠ م عصري نوشته نیه عصري شرنقه ، عصري ماده وقوته . به ملت لەش ساغ ودەوله مندابي

ح — سامان : کوردستان که مالی کوردانه ، وقبري دوژمنانه وقبلەي ملی مانه ثروتی طبیعی زوره . آو واراضی به به ره کت شلالەي یه قوت معدني و کونه وت ، زیرو زیروي خه لوز ، آسن به نه رخی تیـاهه ، حیوانات ونباتاتی جوي جوي زوره بیشه وجنگەلي بي حسابه .

وطنی وملتي که امنده دەوله مندبي حیف نیه ؟ شورة بي ئه ؟ آبرو چون نیه ؟ اولادي فقیر بي ، حیف نیه دەستی زلت بو اسبابي معیشت پان بکاته وه ( ! ) هه ول بدەن ! هه ول بدەن ئه م ملته که خوتان اولادي جگەر گوشەي اون له فقیري رزگاري بکەن . به چي ؟ شرکت .

شرکتی جل ، توتون وجگەره ، دار وخلوز ، میوه ، حبوبات ، سه یرا کاي هاو بنان ، کیتب نوسین . هیچ نه بي بەم شرکتانه که لي پارەي وولاته کان نادەین به بي گانه که منتیان لي نازاني . که پاره شمان بو هەمو شتیکی پیدا کەین براکانم .

لاویکی کورد

## داخوازنامه

من دي روهنیکی هلبو بوژ داماس
شفق دابو جزیری و ارضی قافقاس
بربرجا بلك لي پرسیار بون
من گوتیوان کی پینج حرفی هاوار بون
نه دی نامی لناف کردان یکی میر
ژ بوچاپا هاواری چیبکی زیر ...
سلافی گوهراني لعل و در
ژ بر کردی جزیری هدیه ریکر ...
تو خوش هاتی هاواری سرسری من
نه صوهتی جان و جرگی دژمنی من
رجو کارم ژ میری خوی جلادت
وطن پرور خوداني تخت و دولت
تو روزناما کی کردی بو مه چیکی
سری سـالی ب حرفین نو فریکي
بسه نامی خبردانا گو پربی
وکی دربی اوی هربی قدر بی

احمد نامی

## فرهنگوك

كما كنا بينا في العدد السادس من جريدتنا أن قسماً من قرائنا، سألنا تفسير بعض الكلمات التي تصعب عليهم معانيها باللغة العربية . وقد اجبنا الطلب وخصصنا صفحة لذلك ! اما عدم تفسيرنا الكلمات في العدد السابع هو أنه لم يسألنـا احد من قرائنا الكرام . وقد وردت الينا من جديد رسالة من أحد شباب اكراد الصالحية ، محتوية على بعض مفردات يطلب الينا تفسيرها . وكانت رسالته مسطورة بالاحرف الكردية الحديثة . وقد اتقنها بمدة وجيزة اتقاناً حسناً . فنحن نهنئه

# آواتی دوری

أي چاو ، چه شنی بازی قفس هەلدەري
[ پە رت ،
كوا باله تیژه كانی نگــاي حسنی
[ دلبرت ؟ ..
كوانی دوچاوي مست ؟ كوانی ؟..
كوانی بروي پیوەست ؟ كوانی ؟ ..
كوانی زلفی رەش ؟
كولی آل وگه ش ؟ ..
كوا هیكلی جمــال ؟..
كوا حسنی بی مثال ؟...
أي گوي ، ذلیلی چاوم و به رتوپه نا
[ أبەم ،
ده نگی له ياري دورەوه چیبكەم له
[ زيل وبم ؟!
بابی خوندەي پرآهنك بی !
نغمەي تازي شوخ وشنك بی!
زرەي بازن بی !
بەره ولاي من بی :
هارەي هیــاسه كەي ،
ورشەي كراسه كەي!...
أي حسن شامه ، له چاوولە گو بچه
[ مأیوسم ،
بونی له یاره وه دیتی ختامن أفسوسم ؛
بابی ، بونی هنه سەي بی ،
پر به سینەم وەك تاسەي بي
بابي بوي مه مەي
لەدرزي سوخمەي ؛
بوني وه نه وشه ، گول ،
میخەك ، عطر ، سمل ....
أی لامسه ، أگرچی نە بو دەنگو ، رە
[ نگو ، بو ..
وەك شیت ، به عقلی خامەوه ، خوم
[ خسته به ختی تو ؛
كوا تمامی لەش نه رمی ؟
كوا الذتی كوش گه رمی ؟..
كوا مەكي پرچنك ؛
لیموي باغي سنك ؟ ..
كوا ماچي لیوي آل ؛
جرعەي أبدر خیال ؟!...
أي خاطراتی عمري گذشتەم ، وخیالی
[ توم ؟
خنكاوي بحري دوري نه كەي عشقي
[ رنجه روم !
جلوەت له چاوم ون نەبی ،
هەرگز لاي تو نوستن نەبی ؛
چــه شنی آوبنه
دائم بنوینــه :
عشقي قدیمي یار
تاوەختی احتضار !!...

**گوران**

---

أم شعرانه ، له سەراصولی ( فقره ) ریك خراون ، هەر فقره یه ك عبارته له چوار بیت بیتی یه كەم و چوارەم له سەر وزنی عروض وتراون ؛ دوەم وسه یه میش له سەروزنی په نجه .

---

بوخویندن كه مدنی وعصری بی . ایوه پی ویسته ملت تی بگه یەنن هەر دولایان یك بخەن تاافكاري ملت رله مه زیاتر نه بی به دوو كەرته وه . وافرادی ملت له یكتری نا گەن اگه روا بینه وه .

مطبوعات : — بو پیشكه وتن وسەر كه وتن وسەر بە رزی ملت مطبوعات وەك آو ، هوا پی ویسته . قدری زباناتان بگون ، جلیكی جوانی له بەر كەن ؟ الفبای تازه بلاو بكه نه وه ، الفبای كون ، كون بو .

كیتبي علمی ، ادبی ، اجتماعی ، اقتصادی بنوسن ، ترجمەی بكەن ، له چاپی بدەن ، بین به آبو نەی غزەته ومجله . ایوه جسارتی ادبي بخنه میشكي ملته وه . توسیعی مطبوعات ونشری مؤلفات به اصولی شركت بو كورد زور باشه وزور یه سو كی موفق ئه بی و كورد ئه كه ویته دورەی انتباهی حقیقه وه .

مكتبي ملی : ایمه مكتبي ملی مان نیه ، امه ناته واویه كی بي آمان و گەوره یه ایوه كه دل بریندارانی كوردن وجگر سوزن هەول بدەن مكتبي ملی زور كەن ! دیاره كه خومان لەشی خومان دەرمان نه كه ین كەس نایكا ( ! ) [ هزار سال بكەی بیگانه په رستي له آخر یدا دینیت نشستی ] عبرت . مكتبي دیهات ریك بخەن .

تأریخ وجوغرافیاي ملی : زور شورەیی یه بو خوینده وارانی كورد وبه تایه به تی بوایه كه تا ایستا تقریباً هیچ هه ولمان نه داوه بو زیاد كودنی تأریخمان ( ! ) ئه بی چاك بزانن لاوانی اقوام كون به كوني وولاتیان ئه گه رین بو توسیعی تأریخیان . چونكی تأریخي ملی خالقی شعوري ملیه وولات گه ران زی = حسن برایه تی وناسیاوي ئه خاته میشكی افرادي اقوامه وه . به كوردو كوردستان چي لاو یكی بزاني هیالایه چند به رزه ؟ میسبی چند دریژه ؟

# مشوری دوا روز

بولا وانی کورد !

۱ — براکانم ! جاران وامان ئەزانی ئەگەر ایرو نانیکمان بی هیچ مشور خواردنی سبەینی مان بە پی ویست نە ئەزانی . لە بەر ئەمە دە توانم بلم : هەرچی ناتە واو یك هە یە لە وولاتە کانا چە علمی ، چە اقتصادی ... هند گە شتی لە بەرمشور نە خواردنە ولە بەر بی باکی هاتوتە میدان وزل بوە . انجا ، ایوە کە لە دوا روژدا جی باو کو باپیرتان ئە کەویتە دەس وئە بن بە ماموستای پیشکەوتنی قوم کتان بە باشم زانی لە [ هاوار ] دا هاوارتان بینمە بەر ولە ناتە واوی وطن وملت توزیك باستان بو بکم کە لە حیاتی عملیتانا تە واوی بکەن . و پە لی ملت بگرن وبی بەن بوساحەی پی شکە و تن وسەر بە ستی . لە م جولانە وە یەدا بە عقل ومنطق حر کت بکەن .

چونکی لە حر کاتا لە عقلو منطق دوور کە وتنە وە ملتی پی محوا بیتە وە کە امە ش خذمت نیە خیانت وجنا یتە ... !

۲ — هاو خو ینە کانم ! پی رەوبی ایستای ژیانی وولات وملتە کان زور ناریکە هیچ مکین نیە شان بە شانی مدنیت بروا : خرافات میشکی وملتی پوچ کردوە ( ! ) لە بەرامە لە پیش هە مو شتیکدا هەر چی خرافاتیك لە مالی خوتانا لە شاری خوتانا ، لە دیهاتدا چە خرافاتیك ئە بینن هە موی سنگە و بەرد بینن !!!! ئە ویش بە شینە بی . لە فجری تأریخە وە تاشەری گە ورە کورد یعنی ملتە خوشە ویستە کان لە گە ل اقوامی روژ هلاتدا ناسیاوی هە بو . بە هوی شەری گە ورە وە لە گەل روژ آوا یکانیشا ناسیاوی پە یدا کرد . مزیتی اسامی ملتە کان یعنی کورد بە هوی تنها ناسیاوی لە گە ل اقوامی روژ هلاتا نەو تاوە ، دار زاوە ، داوە شاوە .

لە هە مو هنگا و یکی تجدد و پی شکە وتنتانا بەك سەر لا سایی اوروپا یە کان بکە نە وە ؛ لاسایی روژ هلاتی کردنە وە لە تجدد دا بو ایمە بی کە لکە . چونکی لە شرقدا و بە تایە بە تی لە دە وروپشتی خومانا چە ابینن هە مو بە مدنیت رەنگ کراوە بە لام ناوە کەی هوا زیا ترهیچی تیانیە .

ملت بو یە اولادی خوی ئە نیرتە مکتب ومزگە وت

## چەند پند

ناکس حمی بونە میر و آغا
یی أف کری مالاوی نە آقا .

*

رابە هرە نك هفال و کالان
دات نکفی نوال و چالان .

*

درمانکی چیکە بو برینی
دات نکفی دناف نفینی .

امین عالی بدرخان

واساسا اوروپا یە کان لە تجددا ماموستان وتیاپی ربون ... بەفیربونی زبانیان ئە توانن یەك سەرمدنیتن حقیقیان لی وەر گرن .

۳ — ملیت مقدسترە لە هە مو معتقدایك : — قومە کتان گەلی فلاکتی دی وا گەر ایوە بە عزمو ثباتیکی بەرزەوە هە ولی بو نەدەن تووش فلاکتی زلتر ئە بی . سبین حقیقی امە کە هەمو فردیك لە عینی درجە دا معنای ملیت تی نە گە نیراوە . تاایستا منوران محترممان هەر هە ولیان داوە کە متنفذان فیری مفکو رە ملی بکەن . ایوە ئە بی چاك بزانن هە راوان کوردنین .

جوتیار ، فلاح ، دارفروش ، آودیر ، صنعت کار ، تجار هەمو کوردن . فرضە لە سەرتان لە حیاتی عملیتانا لە گەل جوتیارا ، فلاحا ، شوانا ، گاوانا ، تجارا ، صنعت کارا ، آودیرا ، بە صورتیکی دیموقراتانە بجولینە وەوتی بگە ینن ملیت مقدسترە لە هەمو معتقداتیك ولذتی بخنە میشکەوە ، وتی بگە ینن لەم عصرەدا بی ملیت ژیان محالە وئە بی کوردبو کردیژی .

بو پیشکە وتن چیمان ئە وی ؟

٤ — زانست — لەش ساغی — سامان

۱ — زانست : چونکی خوتان لە گەل زانستە خەر بکن بە پی و یستی نازانم بامی زانست تان بو بکم . لە ولاتی مقدسمانا زانست بە دوو ریگە دا ئە روا

۱ — مکتبی رسمی . ۲ — خو یندن لە مزگە وتا .

## -- ژینەم خەو --

شەو یکی روناك وەك چهرەی دلدار ،
آسمان بی پە لە ، زەوی خاموش بو ،
جریوەی ئە ستیرە لەدور وە کو تار ،
بو دلی برنیار زور بە خروش بو ٠

لە لا یە شندی دلگشای شە مال ،
لە لا یە بلبل مست بوی گل ،
منی بیچارە ش گیرودەی خیال ،
بادەم پر ئە کرد لەخو یناوی دل ٠

هیندەم خواردەوە خو بنی گە ش وسور ،
نەم ما توانای سبری طبیعت ،
بازم دا ، دە رچوم لە جهان ، لە خلقت ،
فریشتە آسا فریم سەرە وژور ٠٠٠

کاتی ماندو بوم ، شابا لم شکا ،
نیشتمەوە لەناو گل و گلزاری ،
جی یکی تنها ، نە بو گیانداری ،
مامە وە بی کس ، بی یار ، بی نوا ٠٠

تاچاو بربکا هر لالەزار بو ،
گیانداری تە نیا بالندەی بی خەم ،
تارو ربابی دە نگی هزار بو ،
هیچ بو لە چاویا باغە کەی ارم ٠

خستمیە ترسە وە چولی وتە نیایی ،
هاتەوە بیرم بە لینی یزدان ،
بهشتە ، ووتم ، ایرە بی گمان ،
نە مالام ابتر بیری دنیایی ٠٠٠

هاوارم کودە ایزدی بی چون ،
فریادرسم بی لەم وحشتزارە ،
یارهبرم بی بوریگای دەرچون ،
یازە حالیم کا لەم سروکارە ٠٠

تا گاه لە پە نای داریکی بە رزا ،
هاتە دەرەوە پیریکی فانی ،
سراپا بە رگی سپی لە بە ردا ،
پرچیکی دریژ هتاسەر شانی ،

دو چاوی گە شی براق و پرنوز ،
رو پیکی بشوش ، رویشتینکی وقور ٠

***

نزیك بو وە لیم فرموی «أی رولە ،
«توچیت ، چە کارەیت ، آدەمیزادی ؟
بە ندیت ، آزادی ، ماتی ، دلشادی ؟
چون ربت کە وتوتە ئەم جیگا چولە ؟»

ووتم «من کوردم نە تەوەی ساسان
پرستشکاری آدە . رو أیزد ،
هاتوم ببینم عهدی پیشینیان ،
تی بگەم دوری دارا و یزد گرد ،»

«بریژم بویان قرمیسکی خوینین ،
هاوار بە رمە بەر تاجداری میدیا ،
بلا لیمە وە ، بکەم زاروشین ،
تا کو هر مزمان بگا بە فریا ٠»

فرموی «بابروین بولای آکباتان ،
لە وی ببینە بە هردو چاوت ،
گیانی پیشینیان ، میدیا و کیان ،
ایستایش هەول ئەدەن بوبە رزی ناوت ٠»

***

بە جوتە رو یشتین تا گە ینە شاری ،
پر لە آوازەی شایی وزەما وەن ،
پر لە فریشتە و پە ری شوخ وشن ،
نەم دی لە ناویا غمباری جاری ٠٠٠

لە هرلا یاری ، گوپین ، جلیتین ،
لە هرلا تەقەی نالی شورە سوار ،
لە هرلا جلوەی روپیکی نازدار ،
لە هرلا لە نجەی یاریکی شیرین ٠

لە هرلا شوری ، سازو نوایی ،
لە هرلا دە ستەی شوخانی خوش گل ،
لە هرلا بانگی ، سیگاو صبایی ،
لە هرلا چیمن ، صحنی خوش گل ٠

لە ولاوە کوشکی ، بە رزوسە رآزاد ،
پنجەی لی ئە دا لگل کوکشان ،
سرفروی ئە بو مانگی درخشان ،
داخ لە دلی بو بابل ، اور ، آکاد ٠٠

دە ستە یە گوردی جوان وجنگاور ،
پوشیدە زری و بە رگی آسنین ،
گورزورم بە دە ست ، جنگی ودلاور ،
دە وریان دابو ، بو بون بە پە رژین ٠

پرسیم لە رهبر «کی یە خاوەنی
ئەم کوشك ومرا ، ئەم قصر وجاهە ؟»
فرموی «نشیمن ، پایتخت شاهە
«موفەر کە خولی ، دارو دەوە نی ٠»

لە پاشی کونوش وسپاسی یزدان ،
دە ستورمان وەر گرت بوخذمتی شا ،
چو ینە آستانی کیوان لە آسمان ،
لەناو دبدبەی سەری سور ئە ما ٠٠٠

خوا وە ندی بابل ، قیصری روما ،
فرعون مصر و شاهی نارام زین ،
همو سجدە بەر ، زانو بەرزمین ،
بو تخت داراو ایوان کسرا ٠٠٠

شاهی کشرر گیر بوم هاتە گفتار ،
فرموی «پیشکەش کە سپامی خسرو ،
«بە کوردی بدبخت ، بە کوردی هژار ،»
برە پی مژدەی ژیانیکی نەو ،»

«روژی هر هەلدی ، فرار ئە کاشەو»
«بەراست ئە گەری آخری ژینەم خەو ٠»

پیرەوت

## میر و کشه

جار کي میری جزیری در کتبو گری · ری‌یا خوه خستبوطورا هڤیرکان · شڤکی د گند کی فلحان ده ما · دڤی کندی ده دیرك هبو · میر چو بو زیارتا دیری · ژ کشه‌یی دیره ره گوت :

— ازی ژته می پرسان بکم ، لی نه نهو پشتی‌می مهان و نه لِ هر لِ جزیری ، هکه ته لِ وان ڤگراند ازی ته بکم پطریق‌وهکه تَ نزانی ڤگربنی ازی‌ته ژ کشتي‌بی‌بیخم و بکم در گڤانی دیری ·

میر داری وچو · کشه کت تخمینان · کشه روبرو دچلمسی ، ژصبهِ حتا ایڤاری رها خوه د کر ناڤ دستین خوه وڤد کشکشاند · دِ دلی خوه ده د گوت : «خُدی او تُ خدی یی من ئی چاکی ، ازژی کشه یی ته ئی رندم ، أڤ چه‌بلایه کرته آنیه‌سری من ، أزی‌چاوان‌لِ میرڤگر ینم» ·

کشه خوه یی یِ پز وشڤان بو · حالی کشه د کت بر چاڤی شڤانی وی ژي · جار کي شڤان ژ کشه ره گوت :

— باڤو ، أڤ چه‌حالی ته به · چ ، دست‌دابه ته · ژِصبي حتا ایڤاری دفکری و برخوه د کڤی ، کایژه خلامی خوه بلکو من نڤدیرك ژیره‌دیت

ژخوه کشه لِ یکی د گریا کو دردی خوه ژیره بیژه · رابودردی خوه ژ شڤانی‌خوه‌ره گوت‌شڤان کنی و گوت:

—·ا أڤ ژی تشتکه · میرچه د کاره‌ژمه بپرسه کو ام نکارن لی ڤگرینن · قت خم مخوه ؛ من بشینه جزیری ازی بزانم لی ڤگرینم ·

کشه پی قائل بو و دلی خوه راحت کر · می مه بون تمام کشه شڤانی خوه ر یکر جزیری ·

شڤان خوه کهاند برجابلك‌ودر کت خافا میر · میر بکیف بو · ژشڤان پرسی و گوت ·

— کشه ، کایژه دِ بحری ده چند دلوپ آڤ هنه

— هژمارتنا دلوپین آڤا بحري گلك‌هیسانی‌یه · تنی دڤیت تُ امربکی کو دڤین چمان بگرن ·

میر کني و گوت :

— خوه‌ش جهابه · پرسیار پیاددِوا ، هکه ازخوه‌بفروشم چند زیردکم

— بیست ونه

— من اڤ صح نکر ، اڤ چه‌هژماره ؟

— میری من تُ زانی کو عیسی پیغمبر بِ سه زیری هاتبو فروتن · هرحال قائلي کو ژی بِ زیرکی کیمتر به ئي فروتن

میر اڤ ژی عجبا ند و ژی پرسیاریا پاشین پرس کر

— کشه او ، کایژه‌من نهو از دِ دلی خوه‌ده چه‌دبیژم ·

— ازخلام اڤ ژِهمیان هیسا نیتره · نهوتُ دلی خوه ده دبیژی کواز کشه مه ، نه ؟ لی نه ولی یه ، از شڤانی وي مه ، کشه لِ گنده ····

**کومِری بوطان**

---

قصر ، سرای ، خانی و کوچیان پی دخملینن ، دبر وی‌ره دبورن ، سلاڤان لید کن · اوی‌ماچ د کن ، داتینن سرسرین خوه ·

آلین‌ملتین‌بسرخوه ، دسر کلات‌و باژارین‌وان ره ل پیل‌دبن ، دریڤه‌چونالشکری‌ده‌د کڤن پیشي‌یی ·

لی‌آلین‌ملتین‌دیل ، ولٹ‌یاملتی‌مه‌ژهردری‌بدر کری ، لهڤتواندی لسردلی زاروین وان ده‌هلاندینه ·

ملتین دیل دخبتن ، خوینن خوه‌در ژینن کو یانیان ژولاتین‌خوه بڤورینن و آلین‌خوملسر کلات وباژارین خوه ژنوڤه داچکینن

آلاهرملتی‌بِ‌چند رنگان وبِ شکلکی‌دنه · آلا کردان ، ژژور بر بژیرڤه سرهڤ ، سور ، سپی ، کسکه ، د ناڤا وی‌ده روژ دچرسه ·

دڤیت زاروین کردستانی بخبتن و روژ که بری ڤی روژی هلینن ، یرب آزمانی کردستانی ڤه بلند بکن ، ل وی بیروسکینن ، ولاتی‌خوه سر آڤاهیاخوه‌آپیشین‌ڤکرینن‌ودبن تڤا وی‌ره‌بسرخوه وبِ کامرانی بژین ·

**جلادت عالی بدرخان**

سال ١
هژمار ٩
اين
٣٠ ايلون ١٩٣٢

# هاوار

بدى

السنة ١
العدد ٩
الجمعة
٣٠ ايلول ١٩٣٢

كوڤارا كردى * مجلة كردية

## ولات ، ولاتيني و آل

ولات اردى باڤ و كالكين مه‌به ·

ولات او دره كو پيشيين مه لِ وى‌رابونه ،

ژ بونا آواهيا وى خبتينه ولِ وى مرنه ·

ولات أو دياره كوام تيده‌سكينه و روژه كى

دناڤ آخين و يده بينه ڤشارتن ·

خلكى ولاتكى ، ولاتيين هڤن · بورى ،حال

و داو بياوان ب هڤره گريدانه · زمانى وان ،

گريداناوان،هرحال‌وابتين‌وان‌ميناهڤن· پيشياوان

لرخ هڤدورابون، رونشتن ومرنه ·

ولاتى ب ڤنجيا هڤ شادبن ، بر خرابييا

هڤ د كڤن · شين و شاهينتا وان يكن ·

خلكى ولاتكى براين هڤ ، پسامين هڤن ·

هرگاڤ ب هڤره ، دست ب دست ژ بونا

خوەشى ، آڤاهى و آزاهييا ولاتى خوه دخبتن ·

كام و آرمانجا وان يكن ·

ژ بونا ولاتى خوه جان و مالين خوه د دن‌در ،

خوينين خوه بى پروا درژ بنن ·

هرى‌دخبتن كو ولاتى‌وان‌مكڤت‌بن‌دستين‌ملتين‌دن·

لى ملتن هنه كو ولاتى وان ، ب آوا كى ،

كتيه بن دستين نيار و دژمنان · وك ولاتى ملتى

مه ، ولاتى كردستانى · أڤ ملتين ها ژ بونا

رزگاريا ولاتى خوه دخبتن ·

خباتا وان اڤه : روژه‌كه برى يانييان ژولاتى

خوه دربنن ومينا‌ملتين‌دن بسر خوه ببن ، دناڤ

هڤده‌ب خوه‌شى وب ڤنجى بژ ين ·

هر كس‌هژولاتى خوه ، هژ ولاتيين‌خوه‌د كه ·

هژ كرنا وليت د دلى مه‌ده‌هيڤينكه‌مزن و بلنده ·

أم‌بى خرت ،زخم‌وجانڤدا نه · ژبره ولاتينى ديژن ·

ولاتينى د هندرى مه‌ده آ گره كى مقدسه ·

پيتاوى‌آ گرى‌ژمه‌ره‌هر‌تشتين‌وليت‌دبده‌حز كرن ·

زلوره ، دبرچاڤين مه‌ده آخ ، آڤ ، چيا ، دشت

ودار و كڤرين ولاتى مه ژ بين ولاتين دن سپهيتر ،

خوەشتر و شيرينترن ·

***

هرملت‌خوه‌يى‌يى آلكى‌يه · آل نيشانا ملت

و وليته · ئڤايا هييانا‌ملتان د آلاوانده جڤييايه ·

آل ناموس ، رومت و بختى ملتانه · زاروو‌ين‌هر

ملتى ژ بونا باندى و بقدر بونا آلا خوه ، بى پروا

خوه ددن كشتن ·

آ لا هر ملتى ژى‌ره بهايه · دجژن وشاهينتاندە

# کتیبخانا هاواری

هژمار ۱

## ریزانا الفابی باکردی

غروش سوری

ب چرمی خملاندی — ۱۲،۵۰

ب چرمی عادتی — ۱۰

ژ بونا درفه دفیت حق پوستی ب سر بیت خستن



## اشتراكات مجموعة هاوار

في سوريا وتركية والعراق وبلاد العجم وبلاد القفقاس

عن سنة واحدة ۵۰۰ غروش سوري — ۱۰۰ فرنك

عن ستة شهور ۳۰۰ غروش سوري — ٦۰ فرنك

عن اربعة شهور ۲۰۰ غروش سوري — ٤۰ فرنك

وفي غير هذه الاقطار

عن سنة واحدة ۱۵۰ فرنك

عن ستة شهور ۹۰ فرنك

عن اربعة شهور ٦۰ فرنك

المراسلات يجب ان تكون باسم صاحب الجريدة: دمشق — حارة الأكراد

سال ۱
هژمار ۹
اين
۳۰ ايلول ۱۹۳۲

السنة ۱
العدد ۹
الجمعة
۳۰ ايلول ۱۹۳۲

# هاوار

كوڤارا كردي * مجلة كردية

## نيخستييين كوڤـارى



۱۳۵۱ ﻫ | مطبعة الترقي بدمشق | ۱۹۳۲ م

SAL 1
HEJMAR 10
YEQŞEMB
23 Çiriya-Berê 1932

# HAWAR

ANNÉE 1
NUMÉRO 10
DIMANCHE
23 Octobre 1932

## Qovara Qurdî * Revue Kurde

### Têxistiyên Qovarê



### Birê Frensizî



Çapxana Tereki
ŞAM — 1932

## Abonnements

Pour la Syrie, la Turquie, la Perse l'Irak et les pays du Caucase:

| | | |
|---|---|---|
| 1 an | 100 | fr. |
| 6 mois | 60 | fr. |
| 4 mois | 40 | fr. |

Pour tous autres pays:

| | | |
|---|---|---|
| 1 an | 150 | fr. |
| 6 mois | 90 | fr. |
| 4 mois | 60 | fr. |

Adresser toute demande au directeur propriétaire: Emir D. A. Bedir-Khan

Damas: Quartier Kurde

## Qirîyarîya Qomelê

Ji bona Sûrîya, Tirqîya, Ecemistan, Irak û welatên kevkasê:

| | | | |
|---|---|---|---|
| Salqî | 500 kirûş-sûrî | — | 100 frenq |
| Şeşmehqî | 300 kirûş-sûrî | — | 60 frenq |
| Çarmehqî | 200 kirûş-sûrî | — | 40 frenq |

Ji bona welatên din :

| | | |
|---|---|---|
| Salqî | 150 | Frenq |
| Şeşmehqî | 90 | Frenq |
| Çarmehqî | 60 | Frenq |

Her tişt bi navê xweyî têne şandin:

Mîr Celadt Alî Bedir-Xan

Şam : Taxa Qurdan

SAL 1
HEJMAR 10
YEQŞEMB
23 Çiriya-Berê 1932

# HAWAR

ANNÉE 1
NUMÉRO 10
DIMANCHE
23 Octobre 1932

Qovara Qurdî * Revue Kurde

## Leylâna Rastîyê

Nîvê şevê ye. Ezman bê stêr e. Bayeqî sar û dijwar tê. Li ser rêqe asê û xweher bi hezaran û bi sedhezaran qurd, pîr û ciwan jin û zaro, sax û nesax diçin.

Di dora wan de gund û bajar xirbe ne. Ji bixêrîyan dû demaqeve, reyîna seh nayin.

Rez û dehl, zevî u cinin şewitandî ne. Ne fêqî hene ne ji darên de'al.

Mazî, deyndar, rêlî, guhîj û darên berû hişq in. Weq qêlên tirban mane.

Weq qêlên mirîyên qurdistanê.

Qerîyên pez u garanên dewaran xuya nabin. Çarmedor qavil, qavileqî tarî.

Ji dûr ve, herûj, roj dibirike, bajarên mezin û gundên ava xuya dibin.

Ji dûr ve, geleq dûr, di buharê de. qulîlq dibişqivin deşt û mêrg. germiyan û zozan bigiya û bi hêşînayî diqenin.

Buhişta bihn û reng derîyên xwe vediqe.

Lê di wê rê de, di wî gelîyî de ronahî nîne, tav nine, roj dernaqeve, ne rojhelat û ne jî ro java heye.

Birîndar ji êşên birînên xwe, jin û zaro ji birçîtî û tihnîyê dinalin û digirîn. Zaroyên berşîr jî birçî ne. Memiqên dêyan zuwa ne.

Qes qesî nabîne. Geleq caran di tarîyê de rêwingî rêyên xwe winda diqin.

Hineq ji wan diqevin, di qorlal û çalan de winda dibin.

Lê ev qoma qurdî bi zehmet, bi cefa, bi xwîn û birîn pêşve diçe. Di şûn xwe ve di rêça xwe de bi sedan dilsotî, canşewitî û birîndar û miriyan dihêlin.

Bê tirb û bê qêl wan berdidin.

Wisan bisalan ve ev qom bi rê ve çû.

Di tariya şevê de, di badevê de, di sariya zivistanê de pêşve çû, serborî û serhatîya xwe, bi mirî û birîndarên xwe li ser rêya xwe nivîsand û çap qir.

Ev qom şeveqê giha zozoneqî spehî, di peşberê çiyaqî bilind û mezin.

Geleq sal hebûn qo vê qoma he ronahî û şabûnî ne dîtî bûn.

Ji nişqa ve di pêşberê wê de ronahiqe zelal çirisî. Rêya wê a asê; rast, siviq û xweş bû. Ne gevir man û ne stirî.

Çarmedor hêdî hêdî xuya bû.

Ji her gir, ji ber palên çiya, ji her deşt, ji her serên qanîyê gundeqî ava û xemilandî diyar bû û qomê re qenî.

Mêrg û çiman, rez û bexçe bi sosin û rêhan, bi nêrgiz û benefş bi gulnexwîn û belalîzq teyisîn.

Birîndar li birînên xwe dinêrin, dibînin birîna wan goşt girtiye. Dê li zaroyên xwe mêze diqin û dibînin qo êdî rûyên wan ter û taze ne, ne zer in û ne bi hêstir in, hinariqên rûyên wan weqê gul û gulnexwînan sor in. Li memiqên xwe mêze diqin tejî şîr bûne.

Rihspî û pîrejin xwe ciwan dihesin, dibînin qo ji dilên xwe re xort bûne. Ji nişûvên çiyan û zozanan pez dadiqevin jêr. Berx û qariq di çêreqe bor û bilind de xwe hildavêjin û dileyizin.

Xelqên qomê diqenin û distirin, hemî bi govend û saz in.

Hemî ji hev dipirsin:

—Ma ew nalîn û girîn qû ve çu ? ? ! ! !

Çi kewimiye qo çarmedora me ji

nişqa ve, husan ava û xweş, dewlemend û rengin bû ! ! ! ! ! Ma em qetine buhiştê ! ! !

***

Rihspiyeq û pîrejineq bi qopalên xwe serê çiyayî nişa qomê qirin, qomê çavên xwe zivirandin wî çiyayî, hûr mêze qirin.

Di serê çiyayî de, xorteqî bi bejn û bal, xorteqî zexm u nêr, xorteqî çeleng û jêhatî, xorteqî bi goşt û gewde, xorteqî delal û spehî çavên xwe digemirîne û veqêşa tîne xwe.

***

Ji qomê dengeq bilind û kireq şabûnîyê rabû.

Qom ji rihspî û pîrêjinê pirs qir:

—Ez nihû dibînin û seh diqim, ronahîya min ne ji rojê ye, lê belê, ji çavên wî xortî tê ! ! ma çi kewimiye ! ! !

Ji dilxweşî du hêstirên germ li ser rûyê pîrejinê de tên, ji nû ve wî xortî nîşa qomê dide û bi dengê dia û zarî dibêje :

—Qurdistan ji xew rabû ! ! !

*Dr. Qamiran Alî Bedir-Xan*

## Gelo ne wisan e ?

Wê rûjê min cilê xwe biribû ser Cilşo, îrû ez çûme bînim.

« Hawar » di bin çengê minda, qetim hundur, Cilşo ji min pirsîyar qir :

—Ew çiye dibin çengê te de ye ?

Min weqe her car qo ji her qesî re bi îftîxar dibêjim : Hawar e, qovara me a qurdîye.

Li wê derê cindîyeqî qumsor jî hebû, li min mêzeqir . . . mêze qir û bi zmanê xwe got :

Wellahî derew e, bîllahî derew e, ma çawan bi qurdmancî tê nivisandin û ket ew qurdmancê qo binivîse heye ? ?

Ev pirsên ha, çikas giran, çikas manadar û çikas bextê meyî reş îspat diqe.

## Ji xwendevanan re

Hawar hawar te ye
Deng û gazîya te ye
Heqe te hawar divê
Arî Hawara xwe qe.

Kiriqa min tijî girî bû, lê, geleq car, min ev pirsên ha, ji devê geleq merivan bihîstibû. Lê çi biqim ? ev qêmanî ji me ye, ji xwenda û mezinê me ye !

Ji wan pirsên wî cindîyî ez diqarim geleq mana derînim. Lê ezê bi yeq du made ên veqirî derpêş biqim :

1 — Mirovên qurdmanc qo dixwînin, xudan îlm û xudan cih dibin, li paş xwe vedigerin û li miletê xwe di nêrin miletê xwe pir li jêr dibînin, ji bona ihtirasta xwe a şexsî û heywanî, li wî miletî nabine xwedî û dibêje :

« ez ne ji wî miletê qurdim »

2 — Miletê qurd, di pê yî muslimanyêre, ji her miletan bêtir, dînê xwe ajotin ji murşîdê xwe û her çend miletên müslîman hene, bi cavê biraên mezin li wan mêze qir. Lê sed esef wan bi çavên şefketê li me mêze neqir in. Di hekê meda piropaxanda çêqirin; gotin « Miletê qurd ji taîfa ecina, û mutriban e, kabiliyeta tu tiştî di wande tune ye. H. P. . . ( Heta, piropaxanda di wan li miletê me jî tesîr qir. Ji lewra zana û mezinê me ji qurdmancîyê dûr revîyan, bune pêşdarê îlm û îrfan, mêranî û her tiştên miletê biyanîyan ).

***

Hezar şabaş û sipas qo êdin li her cî miletê me hişyar bûye û dibe. Qovar û qitêbên me bi zmanê me derdiqevin.

Ji bona em miletê xwe bi xelqê nasqirin bidin divê xortên me ji nezer û galgalên bîyanîyan îbretê bigirin û xwe bavên gulîyên dara miltetê û bi hejînin. Hawar gulîyeq ji wê darê ye.

*Kedrîcan*

# Hisyarî

Ne ceng û şer, şeva tarî, ne mêranî, ne Qurdistan.
Dilê min zexm û nêrîn e bila her cih be goristan.
Ne ma govend, ne ma zurne, ne ahenga dilê xortan.
Qeser û giş qul û nale, bi xem mehdiq bi xem Botan.

Ji hêlqê ax û hawar e, ji hêlqê xwîn û qortal e,
Ji hêlqê laşê xortan in, ji helqê dengê kertal e.
Ji hêlqê zaroyên sêwî, ji hêlqê jin jinûbî ne,
Ji hêlqê sed birîndar in tu qes naye û nabîne,

Hevalê bûq û destgirtî ne ma kesr e ne ma hêwan
Hevalê jin û dê êdî şeva tarî û goristan

Ne ma Ewrex, ne ma Dêrgul ne man dengbêjê Qurdistan,
Ne ma bexçe ne ma sosin ne ma mamiz ne ma zozan
Ji hêlqê laşê zaroyan ji hêlqê destgirtî
Quro rabe, bi camêrî çima nayî çima sist î ! !
Hevalê hev bibin êdî hevalên hev brayên hev
Hemî mêr in hemî qurd in hemî yeq dev.

Ne botî me, ne xerzî me xulamê axa Qurdistan,
Ne mîr im ez ne axa me peyayê dewleta qurdan.
Welatê min tu î gevre bi nav û deng şehinşah î
Tu mîr î hem tu axa yî tu hem sultan û hem şah î
Buhişta erd û ezman î çiraya dil tu î armanc
Hemî dîl in xulamên te heçî qurd in heçî qurdmanc.
Bilind î tu welatê min, welatê bav û qalên paq,
Tu xweşbihn î tu xweşreng î tu xweşdeng î welatê çaq.
î gul û rez bi deşt û gir bi kesr û burc tu ava yî
Tu sîng û pêsira maq î tu î mehdiq tu ewra yî

Welatê min biqen êdî hemû qurmanc ji xew rabûn
Bi rûyê te, bi çavê te dilê qurmanc hemî şa bûn
Ciwan in lav û dilên te bi hevîn dil geleq xurt e
Rêya me dûr û dijwar e bi hêvî rê geleq qurt e

Tu rêber be tu fermanber em in leşqer em in esqer
Xudanê evd û îman in bi izna Yezd û pêxember.
Ji bo me roj û hêv êdî çira ne pêt û ronahî
Kirêne qurd û Qurdistan bi zanîn e bi avahî

Xweyî dîroq xweyî esl in me da zanîn me da Zerdeşt
Welatê qurd gulistan e, gulistan in zevî û deşt.

Welatê min, welatê xweş welatê paq, Qurdistan
Tu hêlîna ciwan û xort tu î gewher li Xuristan.

Dinê geş bû û talî geş û tirb û gorn ji dil şa bûn
Welatê min biqen êdî, hemî qurmanc ji xew rabûn.

*Dr. Qamiran Alî Bedir-Xan*

# Mîr û Qund

Di wextê xwe de mîreq yê Cizîrê hebû. Geleqî zorqer û dilhişq bû. Xelq nema diqarî bûn zilma wî biqişînin, xwînî bûn û ji welatê xwe derqetin.

Cizîra Mîr Şeref mîna deşteqê, bê avahî û şênahî ma. Avahîyên Cizîrê ji torî û bûman re bû bûn seqan.

Mîr rûjqê, ji qer ve, derqeti bû gerê. Ji xerabeyê gundeqî dadiborî. Du qund li ser dîwarên qavîleqî venişti, diaxaftin. Yeqî ji ê din re digot:

— Mamê qund, qeça xwe nadî qurê min ?

— Ser çavan, lê barê qeça min giran e, ditirsim qo niqarî bî hilgirî

— Heqe behsa kelenî diqî hêsanî ye. Qundê paşîn qenî û ji ê pêşîn re got :

— Ma çawan hêsanî ye, hay ji xwe hebe, kelenê qeça min beramberê çend gundan e.

— Herê, min hay ji xwe heye, lê dîsan dibêjim hêsanî ye. Ma di welatê me de ji gundan bêtir çi heye ? Ma tu nizanî qo Welatê Cizîrê ji zordestîya mîrê me vala bûye, erd û zevî tevda bê xwedî mane. Tu hema ji min gundan bixwaze. Herçend bixwazî, ewçend bidim te.

Weqê mîr ev xeber bihistin, geleq ber halê xwe qet û jûvan bû. Ji wê rûjê ve xwe edil and û êdin zilm ne diqir, digel xelqê xwe di lovan û mihirvan bû.

Xelq ev bihistin. Vegeriyan hatin cihên xwe û welatê Cizîra Botan ji nû ve ava û sên bû.

*Qoçerê Botan*

# ELfAbêya Qurdî

**10**

Bè şiq e qo awayê bilêvqirinê bi ( pez, sed, esqer, ereb, elî ) li dengayîya qurdî çêtir tê û duristir e.

Ez qo botî me van ( è ) yên ha ne weq piranîyê,lè weq hindiqaîy yê, yanî stur ( ë ) bilêv diqim. Digel vè hindê, madam em îrû elfabeqè ji bona zemaneqi-ne ji bona zar û zarawayan-çêdiqin ev dengê ha niqari bû bète nîşan qirin. Herweqî me jî nişan ne qir û ne xiste elfabêya xwe.

Min pirsên jorîn, ji hin xortên eşîra xwe û eşîrén dorê-qo hînî elfabêya Qurdî qiri bûn-da nivîsandin. Ket li xwe ne geriyan û bi ( e ) qe adetî nivîsandin. Hingî min ji wan re ji ( ë ) ya stûr kal qir.

Bi awaqî welê li min vegerandin qo pê mesele safî qirin. Ji min re gotin: ( Di nav wan herfan de qo te nîşanî me qirin, me bè dişwarî ew herf peyda qir qo wî dengî biqare xuya biqe. Jê diyar e qo ew deng tinê bı wê herfê têtè nîşan qirin û ne bi herfeqe din ).

e, i, u, — ê, î, û,

Niho, me ev şeş herf hene qo di pêşberê hev de du tofên di şiqlî de nîzingî hev ditînin pê.

Em van çarên jêrên bibin destê xwe û bi van mijûl bibin:

e, i — ê, î

Lê herweqî me berê jî goti bû, di dengayîya qurdî de, dengdêreq carinan qin û carinan drêj nabit, yanî herçî dengdêrên qo qin in drêjên wan nîne û herçî drêj in qinên wan peyda nabîn.

Ber vê yeqê denqdêra ( e ) herçend bète drêj qirin tucar nabit ( e ) ji ber qo cihderqên wan ji hev cuda ne. Herweqî ( i ) jî bi drêjxwendinê nabit ( î ).

Di destê me de tu herfên din ne ma bûn, û gora destûreqe me divîya bû em bi herfên hevduanî emel meqin. Ji lewra ji bona nîşan qirina tofa paşîn me ev ( ∧ ) nîşana ha pejiranad û navê wê qir bilindeq.

Ev nîşana ha di hin elfabêyên din de jî heye. Lê bi vê ferka qo di elfabêyên din de dengê dengdêran weqe xwe dihê le, cıhdêrqên wan naguhêrîne, tinê bilind dide xwendin. Di elfabêya me de du qarên wê hene : Dengê dengdêran diguhêrîne û bilinq dide xwendin. Lewma dengdêrên bi bilindep hemî jî drêj in û tucar qin nayin xwendın. ( dûmahiq heye )

*Celadet Alî Bedir-Xan*

# DI SOREZAREQÊ DE

Ez û hevaleqî xwe li ser rêqè dimeşin
Em ji qêra hatine qudı diçin ? napirsin.
Ji halên xwe dizanin em,rêwînin kedîm in
Çikas zeman dibore xwe bêmecal dibînin
Sol di lingê me nema, pritîne cilê me
Neynûqê me dirêj in, bûne gulî porê me.
Tinè tiştè bi me re qo weqî berê mane
Qeşqûl gopalên di me. evan bi mer wefane
Histiriyên çavbeloq, carna di qet lingê me
Êşa di van mîratan davit ta ser dilê me.
Gava dibû zivistan mericil canê tazî
Qu havîna germ dihat bêfêde biqe gazî,
Hêdî hêdî canê me keşm û kertîş derdixe
Ber atatan hîn dibin,bivênevê xwe bi xwe
Bi vîlhawî em diçin, bê eklê xwe bê şiûr.
Ev rêya ma bê dawî pêş ve diçû dûr
[ qo dûr

*
* *

Rûjeq dîsan ji rûjan ket hal dime ne ma bû
Ne gund û ne gundîyeq ew cih pêda
[ tenha bû
Çima şûnda hineq deng hate ji nagihanî
Lè bala xwe didimê ew deng pir qûr di
[ nalî.

Min dil qir qo bibêjim : mêze biqî hewalo
Meger ew ji bihîstî, qo gote :
— Ey delalo !
Ev çi deng e dinale ? gelo livî cihê ha
Nebe ew ji weqe me qerampere berbi ba.

***

Wisan derqet texmina hevaloqê niqtedan
Bextreşeqî qurdmanc bû. diqir ax û ox
[ aman
Min jê re got:
— ey bira te çi hal û hewal e?
Çiman wisan li erdê veqetî û dinale ?
Wiji li min vegerand, got :
— « Derdê min giran e.
« Çîroqa min dirêj e, bêt nivîsin roman e
« Ez ji qurdên serhedê; Melazgird e gundê
[ min
« Ez derqetî heft sale. Bi hiş û bi dilê min
« Zmanê me bû sebeb, bû felaqet ji bo me
« Mirovên çavsor hatin, jê re digotin: rom e
« Zmanê me î delal « yasak » qrin bizori
« Zmanê xwe î dixwar bo me qirin
[ mecbûrî
« Êdin curmeq mezin bû, bi qurdmaucî
[ xeberdan
« Guhnedanî hedê qê ? heps û sungi û
[ zîndan
« Êdin wisan nedibû, me cendeqan xwe
[ qar qir
« Li hemberî dijminan me hespê xwe pir
[ xar qir
« Lê . . . feleqê bi me re nebir serî em
[ kels man
« Weq e noqên liqevir em li deran bêqes
[ man
« Dê û bavê min hemî bi tevayî wendane
- Hevalê minî ewilî xwe avête nav -
— Gelo tu ket nizanî li qîjan alî mane ?
« Lo; birao! zinaro Çiman tu min nas naqî
« Ez Ferzandê birame, em in ji dê û bavqî

***

Herdu biran himbêz bûn bi qul girî û
[ qeser
Erd û ezman hejîyan, agir qete dar û ber.
*Kedrican*

# L'Alphabet Kurde

## 9

Ce son est dû à l'influence de la phonétique Kurde, ou plutôt a été gardé dans ces contrées sous cette influence; les mentagnes du Kurdistan se prolongent en effet jusqu'au Khozistan, et à Chiraz on trouve beaucoup de Kurdes ( Bextiyarî )

Le ( خو ) correspond tout à fait au son que nous avons noté par le « xw » et quil est prononcé par les Kurdes.

Le son que l'auteur de la grammaire persanne veut noter par un ( ڤ ) surmonté de trois points, c'est à dire un ( ق ) à trois points, n'est autre que le « q » Kurde suivit de la voyelle « u » amalgame du ( w ) et de l'( i ) Kurde qui endurcit la prononciation. L'auteur trouvant ce son plus dur que le ( ك ) ordinaire, mais plus doux que le (ق) l'a figuré par un (ق) en lui ajoutant un point pour l'adoucir, tel les mots ( qul, qur, qun, quç ). Mais la langue persane, étant écrite avec des lettres arabes et possédant une vaste littérature écrite de la sorte, a été trés influencée par la phonétique arabe. En conséquence le son que nous avons transcrit par la voylle ( u )s'est complétement transformé en ( ـُ ) arabe. L'auteur qui ne pouvait apercevoir la voyelle, a attribué cette variation du son dans la même consonne à une variété de la consonne ( ك )qui aurait produit une nouvelle consonne, et il l'a noté par un ( ق ) à trois points.

De même certains Kurdes ayant étudié l'arabe dans des Medressets et habitués au syetème, utilisé par l'alphabet arabe,qui consiste à compenser le manque de voylles par la multitude des consonnes, prétend que dans la langue Kurde

( à suivre )

Notices sur la littérature moeurs et coutumes Kurdes

10

# MEMÊ-ALAN

Une seule personne était arrivée à connaîte le motif véritable du deuil de Zîn. C'était Beqoyê-Avan, le magicien de Botan. Comme tout le monde, il avait trouvé l'affaire extraordinaire, et il voulait connaître la vérité. Résolu à trouver le mot de l'énigme, il éntra dans son cabinet de magie.

C'etait une petite chambre, au plafond si bas qu'un homme de haute taille n'aurait pu s'y tenir sans se courber. Dans un pot contenait un liquide qui bouillonait comme du goudron. Dans un autre coin, on apercevait des chauves-souris, des ossements et un crâne de très grande dimension. Dans le troisième coin gisaient pêl-mêle de petits objets; sacs, fils, lambeaux d'étoffe, chevelures de femmes couteaux, ciseaux. Dans le quatrième, des têtes de serpents et de lézards émergeaient de vase sà demi brisés. Au milieu de la chambre se trouvait un bassin dans lequel nageaient des fées de mer et des poissons de couleurs variées. Un chat noir, dépourvu de poils, maigre comme un squelette, se promenait de ci de là. Beqo toucha le chat de son bâton, puis le frappa de quelques coups. Le chat se jeta sur les serpents et se mit à les griffer. Les serpents s'éveillèrent de leur lourd sommeil et commencèrent à remuer. Tour à tour, les animaux et les divers objets disposés dans la chambre se mirent à danser et sautèrent au plafond.

Toujonrs avec son bâton, Beqo traça sur le sol un cercle au milieu duquel il plaça un entonnoir; et sur l'entonnoir, il dèposa un miroir qui révélait le monde et ses habitants. Au bout d'un moment, des figures apparurent sur le miroir, puis surgit le palais de Memê-Alan et l'aventure de cette fameuse nuit se déroula. Beqo se mit à rire, et dit: « Voilà un nouveau prétendant qui viendra du bord des mers lointaines ». Il laissa l'appareil comme il l'avait disposé; tous les animaux et tous les accessoires de magie menaient la sarabande.

* * *

Mem se réveilla tôt; d'un sursaut, il se dressa sur le lit : les yeux fixés sur la bague de Zîn, il se remémorait l'aventure de la nuit. Il s'en souvenait parfaitement: Les noms eux-mêmes lu. restaient présents:(Cizîra-Botan) ( Burca-Beleq ). C'était la prmière fois de sa vie qu'il avait entendu parler de ces lieux; il ne savait qu'une chose: sa visiteuse de la nuit. était la fille d'un prince kurde. et venait de trés loin. Mais comment était-elle veue ? comment avait-elle pu pénétrer dans ses appartements ? Comment avait-elle si subitement disparu ? Il ne pouvait se l'expliquer.

Bengî de son côté s'inquiétait, il ne savait comment interpréter l'évènement de la nuit. A deux heures dé l'après-midi, Mem n'avait pas encore donné signe de vie; inquiet, Bengî s'approcha doucement des appartements de Mem.

Mêm entendit le bruit des pas; comme il ne voulait voir personne, il cria de sa chambre: « que personne n'entre, je n'ai besoin de rien. S'il me fallait quelque chose, je vous appelerai ».

Bengî revint sur ses pas, et rejoignit ses camarades. Il les consulta. Ils décidèrent d'entrer chez leur maître, coûte que coûte, même au prix de leur vie.

Bengî choisit les pages favoris du prince, et en leur compagnie il entra brusquement chez son maître. Mem ne leva pas même la tête; il était triste, pensif, il semblait qu'il eût maigri et vieilli. Bengî lui adressa la parole :

« Altesse, qu'avez-vous? pourquoi êtes-vous si triste et si mélancolique ? S'il s'agit de la jeune personne, qui à l'entrée de la ville, au retour de la chasse au chevreuil, vous a jeté des fleurs, Votre Altesse n'a qu'un ordre à donner. Je n'aurai bezoin que d'une minute » . . . .

Mem interromppit Bengî d'un signe de la main, et dit : « Voilà mes ordres, tais-tois, ne dis rien à mes parents de l'affaire de la nuit dernière. Va me chercher Bogzê-Rewan, prends dans le trésor de l'or et des diamants; fais moi monter sur le cheval de mer et indique moi la route de Cizîra Botan ». (à suivre)

# A propos de la musique Kurde

Un de nos distingés lecteurr d'Alep, a l'occasion d'une lettre qu'il nous a envoyé pour nous féliciter d'avoir adopté les caractères latins, nous a donné ses impréssions sur la musique Kurdes. Il nous a paru intéressant de publier cette lettre qui démontre l'impression que la musique Kurde a faite sur un étranger ne connaissant pas le Kurde. En saisissant cette occasion nous voulons remercier l'auteur de la lettre, pour la sympathie qu'il a manifesté envers nous et pour les voeux qu'il a bien voulu formuler au sujet de notre revue. « Hawar »

Mon cher Emir,

Je vous remercie très vivement pour le No de la Revue Kurde « Hawar » que vous avez eu l'amabilité de m'envoyer, et je vous prie de vouloir bien m'expédier aussi les Nos précedents pour que je puisse en avoir la serie complète.

Depuis plusieurs années déjà, je porte un intérêt spécial à l'Histoire du peuple Kurde, et depuis que je suis en contact ici et au Kurd-Dagh, avec vos compatriotes, j'ai essayé de me faire initier aux secrets de votre langue et aux beautés des chansons populaires Kurdes. Ces mélopées exercent même sur l'étranger qui les entend pour la première fois et qui n'en comprend point les paroles, un attrait et un charme très sensible.

Vous avez réalisé un grand pas dans le chemin du progrès en adoptant les caractères latins pour votre langue aryenne, et en facilitant ainsi la diffusion de l'écriture parmi le peuple. Je suis certain que vous marchez ainsi à pas sûrs, vers une Renaissance de la langue et de la Littérature Kurde; et si vos contemporains n'apprécient peu-être pas tous avos efforts comme ils le méritent, les générations qui suivront vous en garderont une reconnaissance éternelle.

Je salue donc en vous le Pionnier de la Renaissance littéraire dans la Nation Kurde, et je vous prie d'agréer, mon cher Emir, avec mes sentiments d'admiration sincère, l'expression de mes congratulations les plus vives.

*Dr G. Michaelian*

Textes et Traductions ;

## Bêmalê

— 1 —

Bèmalè, dinè li te qer e, li min fat e
Hawar li te qer e, li min fat e
Li ser serê min û bejna bilind taveqê
[ barana hûr tê
W' ezè naqim terqa bejna bilind, çavê
[ reş û beleq
Heta serê min biqeve li ser darè vê tabûtê
Ax rebî rebî . . . . . . . . . . . . . . .

— 2 —

Bèmalê ! dinè sibe ye, roj derqetî ji
[ alîyê Botan
Rebi ! sibe ye, roj derqetî ji alîyè Botan
Tavè da li bedena Diyar beqra şewitî
[ Kîzan û xortan

— 3 —

Xwezî mirazê min û bejna bilind hasil biqira
Minê qirasè ber bedena xwe bifirota
Ax eman, eman . . . . . . . . . . . . .
Bèlome ye.

— 4 —

Ax rebî ! megrî megrî tu delal î
Hawar çavè reş û beleq ji qilê sibhanî
meqe xalî
Hema tu min î, qirasè di min î, qirascanê
[ min î, helalmal î
Ax eman, eman . . . . . . . . . . . . . .
Bèlome ye.

## O sans maison

— 1 —

O sans maison, le monde est sourd à
[ toi, il m'est ouvert
L'appel au secours est sourd pour toi,
[ à moi elle m'est ouvert
Sur ma tête et sur la taille haute, tombe
[ un nuage de pluie fine

Je ne quitte point la taille haute,les yeux
[ noirs et pigmentés
Jusqu'à ce que ma tête tombe sur le
[ bois de ce cercuil
Ah! mon Dieu . . . . . . . . . . . . . .

— 2 —

O sans maison! c'est le matin, le soleil
[ se lève du côté de Botan
Il jeta la lumière sur les murailles de
[ Diyar-Bekir, l'ardente, sur les jeunnes
[ filles et les jeunnes hommes.

— 3 —

Ah s'il accmplissait mon voeu et celui
[ de la taille haute
J'aurai vendu la chemise de mon corps
Ah, eman. . . . . . . . . . . . . . . . . .
Ceci n'est pas à reprocher

— 4 —

Ah Mon Dieu, ne pleures pas, tu es belle
Ah non, ne laisse pas les yeux noirs et
[ pigmantés sans collyre
Ah oui, tu es à moi, tu es ma chemise,
[ tu es ma « chemise-coeur » tu es
[ chaste et pur
Ah eman . . . . . . . . . . . . . . . . . .
Ceci n'est pas à reprocher

*
* *

Dans la langue Kurde le mot ( qer ) qui signifie ( sourd ) et aussi (muet). De même que «xwe qer qır» mot à mot «s'est fait sourd» veut dire«c'est tut». En conséquence le premier vers de la première strophe signifie « tu es encore jeune, tu ne comprends pas le monde, ainsi que les appels au secours ».

L'expression de ( sans maison ) qui n'a pas d'équivalent en français à la rigueur peut être traduite « ô ma petite sans chaumière ».

L'expression de ( chemise-cœur ) nous l'avons trad'uite du Kurde tel qu'elle est. Elle signifie [ l'enveloppe du cœur ).

Ce qu'il y a de plus interessant dans cette chanson c'est sa tonalité. Un genre de mélodie propre à l'intérieure de la ville de Diyar-Bekir,et chanté surtout par les appaches (pêxwaz )litéralment traduit ( va nu-pieds ).

Ce genre de mélodie s'appelle ( Keyda binê bedenê)et quelques fois (Keyda Hewselê)

La première veut dire (Melodie du pieds de la muraille).Cette dénomination provient du fait suivant:

L'ancienne citadelle de Diyar-Bekir, jusqu'à nos jours est en bon état et possède différent tour de flanquement qui sont encore habitable. Les apaches de Diyar-Bekir, renommés dans tous le Kurdistan, mènent une vie tout à fait propre à eux. Ils portent un costume spécial avec un poignard à la centure, portant le nom du précieux acier Kurde ( Teban ). Dans la ville il y avait des métiers qui leur étaient spécialement réservés.

Jusqu'aux derniers temps dans la ville de Diar-Bekir il n'existait pas de maisons de plaisir.Ces appaches divisés par groupe, d'après les quartiers de la ville, avaient installés, sous les murailles de la citadelle dans les tours, des locaux d'amusement où ils amenaient des femmes,jouaient de la musique et s'amusaient. Alors les mélodies des chansons qu'ils chantaient sous ces murailles avaient prises le nom de ( Keyda binê bedenê ).

La ville de Diar-Bekir est située sur des rochers plus haut que la vallée. Ses jardins qui sont dans la plaine et plus bas que la ville portent le nom de ( Hewsel ). Pendant l'été le groupe des appaches avec toute leur organisation descendent aux jardins du(Hewsel)où ils continuaient à s'amuser. C'est pour cela que ces mélodies quelquefois aussi s'appellent ( Keyda Hewselê).

Les lecteurs qui s'intéresseront à la mélodie de cette petite chanson, la trouveront dans le disque de la Compagnie Odéon No (220597) chanté par Mariam Hanoum.

*Hercqol Azîzan*

## Biyanû

Ji ber qo xweyîyê Hawarê bo qarûbarinen qovarê çû bû derve qovar niqari bû di dema xwe de derqevit.

Ji xwendevanên xwe hêvî diqin li me megirin û tê biborin. *" Hawar "*

## بیانو

لە بە رچونی خاوەندی هاوار بو دەرەوەبوهندی کاروباری کوڤارە کە نە توانی هاوار لە وختی خویدا دەربهینری ۰ تکالە خوینە رە کانمان دە کەین کە لم بابە تەوە لیمان ببورن ۰

ژ بر کو خوە یی بی هاواری بو کاروبار نن کوڤاری چوبو درڤە کوڤار نکار بو دِ دە ما خوە دە در کڤت ۰ ژخوندە ڤاینن خوە هیڤی دکن لمە مگرن وڤی ببورن ۰

## سنور

لەم روژانە دا قصیدەی « سنور » مان ، کە لە لایەن عبد الخالق اثیری کرکو کی یە وە دانراوە ، وەر گرت ۰ وختی خوی ئەم قصیدە یە لە مصر بە ناوی حاجی قادری کو یی یە وە لە کتیبی « شرفنامە » دا چاپ کرابو ۰ و بە هیی مرحوم دە زانرا ۰ ئیمە ایرە راستیە کە مان — لە سەر آرزوی اثیری — لە توفیق وهبی بك پرسی ، فرموی « بلی ئەم قصیدە بە هیی عبد الخالق اثیری یە » ۰

لە نسخە کەی یرە وە ماندا هم قصیدە کە دە نوسین وهم ئە وە دە نوسین کە چون بە هیی حاجی قادري مرحوم دراوە تە قلم ۰

ژلورە مە دست ب دریختنا هاواری کر والفابی یاخوە ژ کودو بیانیا نرە دا زانین ۰ ایرو دِ میدانیدە تشتکی چیکری هیە ۰ کوڤارك والفابی بك - الفابی بك و کوڤارك ۰ تلك دلیمن ژ بونا ایرو یا چیتر و راستر أڤە کو ام هیلا خوە یدن وڤی الفابی بی حتا هنگی کو محجتا عدلاندنی بکڤت پیشی بی وری لِ مە بکرت ، پیشڤە بین ۰

د گل ڤی هندی دڤیت أز جار کە دن ژی بیژم کو أم هر گاڤ میلداری یکیتی یی نە و آرمانجا خباتامە یکیتی یە ۰ أم ب گاڤنن بِ ڤین وهشك یرب آرمانجا خوە ڤە دچن و ناسکنن ۰ ژبر کودستپیکرنا مەژ خوەب درنگی کتیە ۰ ام نما دکارن دهیڤی یی دە بسکنن ۰

گلك سپاسان لِ پیروتی دلال دکم کو اڤ هینجتاما شستە دستی من ۰

**خوە یی یی هاواری**

## بو خوینەرە کانی عراقمان

برا کوردە عراقیە کانمان هـاواریان ، هر لەو روژە وە کە دەمی کرد بە دە رچون ، بە چە شنیکی وا خوش ویست و بە رو بیکی ئ وە ندە خوشە وە بە پیر یە وە هاتن کە دلمانی پر کرد لە هیوا و زات ۰ ئیمە ش بە رامبەر بەم خوشە ویستیە همیشە خومان بە سپاسدار دە زانین و بو زیاد کردنی ئەم خوشە ویستی و رابە رەوندی ئەم برایانە مان هەتا لە دە سمان بیت لە خزمەت دوا نا کە وین ۰

خو ینە رە عراقیە کانمان چی لە نوسینە کانیان و چی لە کاغزە تایبە تیە کانیا ندا پیروز بایی ئە وە مان لی ئە کەن کە هاوار بەم تیپانە و بەم ئیسکە دەر دە هینین ، و راسپیری ئە کەن کە همیشە لە سەر ئەم ری یە بروین ۰

بە لی ئیمە ش ئەم ری بە بەر نادەین ؟ ئەم ری یە ری یکی تازە یە لە ژینی دابی کوردیدا ، و هاوار لە سەر ئەم ری یە یە هە نگاوی نە لە زروك لە رو پیشتندایە ۰

بیجگە لە مە هاوار کە بە دو شیوە دەر ئە چی ، بو ئەوە ش تی دە کوشی کە ئەم دو شیوە یە بە یەك نزیك بکاتەوە کە ئەم ئە ر کە ، چند گران و چند پیروزی یە ، لای شارەزا دیارە ۰

بە لام بو گە یشتنە ئەم پیروزی یە هومایە شتیك گە رە کە ؛ دە زانن چیە ؟ ناشی نەی زانن ، پایە داری هاوارە ۰ هاوار بە چیی ئە ژی ؟ بی گومان بە دراو ۰

هاوار نە لە لایەن کومە لیکە وە دەر دە هینری و نە لە کومە لیکە وە یار یە ئە سینی ۰ هاوار گو وار یکە کە بەهە کی ئابونە دەرئە چی و هر بەو یار یە یە ئە توانی بژی ۰

انجا ، ئیستا رو ئە کە ینە برا عراقیە کانمان و ئە لیین ، « ئە گەر دە رچونی هاواریان پی و یستە ، تکایان لی ئە کەین کە هە کی ئابونە کانیان بە رە بە رە بنیرن ۰ » هیوامان وایە ، گوی لە تکامان دە گیری ۰

### ژخوە ندڤانان رە

هـاوار هاوارا تە یە   دنگ و گاز بیانە یە
هـکە تە هـاوار دڤی   آری هاوارا خوە کە

ستونا نوکهشنیان:

## دلی من برد شوتە

هری لی ٠ هری لی زری یی ، ازی نخوشم نخوشی ناڤاجیان ، سری من عقدالی خدی ناسکنه ل سر بالگیا ، درمانی من ربنی خدی کتیه ڤلی درزیا ، کسکی خدانی خیران تونینه بدستی من بگره من باڤیژه سر ریکی آڤ آنیان ، یکی خدانی خیران دردی دل دیتیبو ، ب دستی من گرتی !از آڤیتم سر ریکي آڤ آنیان، منی بالا خوددایی ژ و بدا تن جوتی دزریان ، یکی ژوان زریا گوت فقیرو اُڤ چه حاله توتیدا یی ، یادنی گوت لیلی پور کری ماتو نزانی نه تاویبونه باو یبو ، دردی کامباخی دل چتنه بو یه با کتیه ڤان هستیا ، یك ژوان زریا سباخیراخو ب سر مدا خوار بو ، منی کری از هریمه طوافا خالا رویا ؛ژشابونا دستیمن کته حللی موری مرجانی استیا ، حللی موری مرجانی استیاب سر من عقدالی خدیدا دقتیا٠

ڤي زري بیي اسمکی لِ من خاندی از کریه مور یکی آڤیمه ناڤ انجیا ، شڤا نیڤي شڤ بو ازب خواڤا هــاتم ، ازو کلش گورا خو کتن کیف حنك لا ڤردیا ، مني نزانی بو پیره کی دمالدا هبو می وسهدرانی پیر یبو، هرمی وسهدرانی پیري ژي دیشیا ، حتانی سي آلی بِ آلی پارخان بِ پارخان ول د گریا ، و یلا ب پیری کلی کذابي شیطانی فسادي فنوني ملعونی : سي شبکی رابو ب تاغیدا مشیــا ، کیف حنکی من زریامنا دلالی کره دنگی آڤیته ناڤ گندیا٠ گندی بیي‌مال‌شوبتی کرنه‌جرسکی‌مزن‌آڤینه‌اشي‌یی‌مه‌هر‌دویا:

ده وایي فلکا مال شو یتی بی بختە بمرانايي ،

از کوریم از کوریم ، چودورا صلاح الدین

سلطانه ، هاتی دورامو ڤانه ، هون رابن گلی کردویرانه ، أم ژرابکن ل سرڤان دژمنانه، دژمن‌دبیژن کرد بی خودی مانه ، هون بزانن أم نه ب خودینه ؛ خودی بی مه بدرخانینه ، أمي هلدن عقدا شیخ سعید شهاب الدینه ٠

**صلاح الدینی سرحدی**

---

## ز بسهامی من وجدی جبل باشارا

پسهام وقتا ڤا بنداته کو لی هاواري نفیساندی باڤی من کو دخوەند عشیرامي برازان لدورا باڤیمن پر روناشتبون باڤیمن‌ژی بدنگکی زیز دخوەند من‌بالا خوه دای هم‌باڤیمن هم‌ژی جڤانا وی هستر کتنه چاڤی کشکانه ٠ پسهام از ژی وکه ته کورده کی قچیکم وکه ته از ژی پر پر ل هاواری هوس دکم٠ هن‌جاران دجی خوەدا دخوینم٠ خو من دغر بولنی‌سبەدا هشیار دبم کو هین هاواردستی مندایه٠ تی بالامن کو ایڤاری من خوەندي یه٠ از دي خوڤا چومه دیسا دست بخوەندنی دکم لی سرڤي بنداته ازو هڤالین مین ام کیش هشیار بون مه بی هڤرا کوت گلو میزه کن وجدی ژی فنا مه کوردمانجه کی کچکه لی بندك چڤاس خوەش نڤیسا ندی‌یه از ژي‌و که‌ته دبستانی‌یانیاندا دخوینمه بلی پسهام ازژی توجار ژي خوش نابم ژ بر کو ته بزمانی مه‌یه ازهین قچیکم عمری من نه٩ ودهن ١٠ وکاته نکارم خوەش بنڤیسنم ڤا پرسن کومن نڤیساندی ژی دی رو په‌لی هاواری دا کومن بندا ته خوەند ژ گوتینن ته وکیفا من هات ڤاپرسانا من نڤیساندن اڤ هشیار بونا من وهڤالین من دیسا دی روی کوردمانجی قچیك ئی مینــا ته‌به پاشی هردو چاڤی ته ماچ دکم پسهام٠

**فوزی مصطفی شاهین**

لاوی میری برازان

---

دپی ره توفیق وهبی بك چو عراڤی٠ لی تشغلنن نخوش قومین کوژ بونا هر کسی نامن ٠ دگل ڤی هندی من‌ژبره چند جاران نڤیساند، لی لمن ڤنگراندبو - ڤي پاشي‌یي مه‌زانی کو نڤیسارین من نه گهابون دستی وی ٠

ژخوه‌در کتنا هاواری ژبونا ڤی یکی درنگ مایه ٠ هاوار دمها گلانی‌ده درکت ٠ من رخصتا هاواری دبست وششی چریا بری ١٩٣١ ده گرت وکارین درختنا وی دپیشیا گجوکی ده ( شباط ) پیك آنیبو ٠ چار مهان أز لِ هڤی یی مام، داکو بِ دستبرایی خوه ڤه دست بدست الفاییکه ولی درینم کو پیشدەتری لِ‌دو بتی‌یی‌ڤمکت٠

لی هروکی من ژورڤه گوت لِ من نه دهات ڤگراندن ٠ ژی بیتر ژی‌من نکاربو أزلِ هیڤی‌یی بیتم ٠

تف ژناف مەرا کرنە. گلو «زبد قائم» ژمرە چد کە؟ ام شانزدە سالان دخوینن، هیژ نزانن عربی مژول بین و نکارن چند خبران ب عربی بنڤیسینن و زمانی‌خوەژی ژبیر دکن و نزانن بخوینن. اڤ ژی ژ دستی‌شیخان هاتیە سریە!

چما ام سر بلند نابن؟

لورا ام، وکی خلکی ژهڤالی خوەنین بلنگازە ب دلخوەشی جڤاتان چینا کن. ملابین خلکی بڕ تڤابی جڤات وخباتی ژ ملتی خورە دکن، پران دجڤینن، بلنگازی خوە پی خوەدی دکن. ام، ملابین کردان ژ بنلگازی ملتی خوە دخون ونادن. گلو چما ام ل آورو پائی تماشا ناکن و یا ل ملابین مصر وهندی مزە ناکن. چاوان او ژملتی خوەرە دخبتن. ژخودی نە روابە کو ژڤی ملتی بلنگاز بخون وژوانرە نە خبتن. روژك هیە اڤ نانی وان لە گلی بکی. دوی روژی‌دە، ام نکارن جهاب بدن.

چما ام ب هڤرە اتفاق ناکن؟

لورا مە نە خوەندیە. چکو پیائی خوەندە حقی هڤالی خوە ناس دکە، وندا ناکە. اگر لاوی گاڤانکی ب قلما خوە مزن بی هڤالی وی تف ژویرە کیانی دبینن. مگر لاوین آغان. ژبرڤی یکی بلنگاز و مزین دمە ب دستی نیاران تینە کوشتن و ب هڤرە اتفاق ناکن!

چما ام بی تاریخ و کتیبن؟

لورا ام گازنا ژ ملا و خوە ندە وارین خوە دکن. حتا نکا ژمەرە کتیبان ب زمانی مە نە نڤیسینە، ب شون خوەدە هشتنە. هندو افغان وایران بڕ زمانی خوە دنڤیسینن چما ام ب زمانی خوە نا نڤیسینن؟ گلو زمانی مە وکە زمانی خلکی نابە ویا ام بیکیرن!! زمانی مە زمانکی سفکە، چالاکە، چلنگە، فرەهە. هر پرسکی دهمبری پرمی‌زمانی خلکیدە هیە. ژزمانی خلکی سفکترە. حچی کو بالاخوە بدنی تاڤل بزانن کو زمانی مە ژزمانی خلکی سفکترو خوشترە. وهارنگە زمانی مە سفك و سر بلند ترە؛ وسانە چما ام ب زمانی خوە وکە خلکی کتیبان چی ناکن؟؟... آخ آخ ئو بیژی ل بژنا سواری مە تی.

جگر خوین

# لسر یکیتیا زمانی کردی

— لە بو پیروتی خوشە ویست —

گوتنین خوبی‌بندا(عکس صدای هاوار) گلك راست وقنجن. دمروان‌رە ت گوتن نینن.

هروکی مە چند جاران گوتیە یکیتیا ملتی کرد ب یکیتیا زمانی کردی تیتە پی. دڕ یکیتیا زمین دە گاڤاپیشین‌ژی یکیتیا حرفانە. یانی ژبونا نڤیساندنا زمانی ملکی دقیت زاناوخوندوارین وی ملتی بڕ تڤابی ژبونا زمانی خوە الفابیکی بژ یرن وهکە دوی زمانی دە چند زار هنە، زارهمی ب وی الفابی پی بینە نڤیساندن.

ژ هژمارا پیشین ڤە خویابە کو آرمانجا هاواری آپیشین و بنگهی أڤە:

« وهرنینی ده یکیتی »

أڤ آرمانجاها ژمەرە بو بە دستور. حتانهو أم بڕ ڤی دستوری ڤە چون، ایرودچن، وددا وی‌بی‌دە دی بچن.

وکی نهو، کر بیاریا هر روژنامە وکوڤاری ژبونا ولاتی بیانیان ژجهی چاپکرنی گرانترە. لی هاوارا کو دهرتشی‌دە میلداری یکیتی‌بی‌یە کر بیار بیاخوە ژبوناهرولاتی کو تیدە کود هنە ولك هڤ کرنە. بڕ ڤی هاوی لــــ هــاواری زیان دیە. ژبرکو حقی پوستی ژبونا سوری بی (١٠) سانتیم، لی ژبونا عراق وایران ولاتین‌ڤفقاسی (١٥٠) سانتیمە. لی آم پی قائل بون داکو کرد دڕ کربیار یــا هاواری دەژی ولك هڤ بین.

بلی ام دزانن کو زمانزانانی بڕ قیمت وهیژا ماموستە پی گوام توفیق وهبی‌بلك‌ژی ب هرفین‌لاتینی الفابی‌بلك‌چیکریە.

پیرار وکی مە هڤدو ل شامی دیت الفــابی بین خوە ژ هڤ رە دان زانین و أو دانین برهڤ. دناڤبرا وان دە فرقن هبون. مە دل کر دجهدە الفابیین خوە بکهین هڤ وژ هردووا الفابی‌بلك نو بژیرن و بلاڤ بکن.

هنگی دستبرایی من ئی خوشە ویست وگوام دکوت کو هن سر الفابی یا خوە دی بخبتم. ژلورا یلك کرنا الفابی‌ین خوە مە آڤیتبو داوی‌بی.

# الهامی هاوار

— بو مفکورەی بدرخانی یەکان —

درویشیکم دی لە سەر دخمەی شا
— شای صلاح الدین — بە کول ئە گریا؛
هاواری ئە کرد ، ئەی لاوانە وە ،
دلی انسانی ئەتا وانە وە !...

***

درویش میریك بو خیوی تخت وتاج ·
چرخ لی ی وەرگەرا کەوتە بە رتاراج ...
ای چرخی غدار ، افسر بازیچە ،
بە حصیر گیری ژش وقالیچە !
سەری را هانوی تاجی سربستی
کەی ئە نە وی بوزندان پرستی ؟
سنگی کە تختە جیگای آرامی
کەی قنیات ئە کا بە یای ناکامی ؟...
وەك شیر نرکانی ، وەك آگرهە لچو ،
زنجیری پچران ، لە زندان دەرچو !
گە لی هە لەتی برد بو پیچکەی تخت
بەلام نە خوسا بەردی دلی بخت ،
گە لی کیشای دەست بوجقەی افسر ·
بە لام ناوچاوی نە نیوسی ظفر !...
سەری خوی هەلگرت ، روی کردە شاران:
تویشوی ری ی تە نیا عشقی کوردستان !

***

ایستا لەدەشتی شام لە سەر قبری
باپیری گە ورەی بو ولات ئە گری ،
بو ولات ئە کا شیوەن وهاوار ...
کوردە غیرتیك زینهار ! صد زینهار !
بە کومەل بگرن گوی لە هاواری :
کومەل جلب ئە کا رقتی باری !...

گوران

سو یند بە آورکدە ومزگەوت و کلیسات دە خوم
سو یند بە آوستە وو قورآن و بە تورات دە خوم
سو یند بە بیت وحرم ومغ کدە و تات دە خوام
سو یند بە خو ینی شهدای کورد و بە سادات دە خوم
عاقبت بهرە پەشیمانی بە دل سوتاون
هەی وطن تا کو فلك چەرخە ئەدات و ئەگەری
آوری عشقت لە همو جەرگ وهە ناوی ئە گری
ناوی تو سەر گوتی ناوانە چی ممکین بەدەر بی
ناوی بەختت وە درەوشیت عدوت گەر بدری
دلی دوژمن لە رقت لەت لە تە چاو پر آون ·

هەژار

# قولوا الحق ولو علی انفسکم

ژبونا شیخ و ملان !

گلی سیدان ازی چند گوتنا ژورە بیژم ، گرك هون نە خیدن · ژر یقە چیمان ام بلنگازن وخلك دولمندن · لورا ام نزانن · چیمان ام گازا چوخ ب دە مجیدیان دکرن و ام گازا شالی خوە ب دە قروشان ناکرن ؟ وها رنگە کرین و فروتنا مە تقدە ژمرە زیانە ، نە کارە اڤ ژی ژدستی ملا و شیخان تی سرینە ·لورا جارە کی دناڤ وعظ و گرتنی خوەدە ژمرە نابیژن ·

چیمان ام نزانن ؟

لورا شیخ و ملابین مە روژ کی ژمرە نابیژن کو ژخوەدە دبستان ومدرسان چیکن · اگر چند مدرسە ل ولاتی مە هنەژی دیسان سیدابین مە ژمرە ژ «زید قائم» پیڤە نابیژن · علم حساب وهندسە وفلکیات وحکمت و صنعت

# هەی وطەن

له خەوی غه فلەت هه لسته که ده میکی تەنگه
چەرخی که چ‌رەو بەدەروشوروری‌وئەی رەنگه
هەلسه وختیکی که لی پیسو و رەش و بردە نگه
وهە بی دەنگی وخەو بو هەمو کوردی نه ئگه
نەنگ بو پیاوبی خراپه که له ریزەی پیاوان

دەمی دانیشتن و آسودە نی‌یه تیکوشه
وختی سستی بو که چی و لیژی نی یه بخروشه
روژی سەر خوشی و بی هوشی نی‌یه هەلجوشه
چاخی خودیتن وآوینه نی یه دای‌پوشه
روژی یك بون وفنونه که نه کەن فووتاون

گەر له خاکی سنەوو بانه ئەگەر بابانیم
گەر له کوردی لەك و لوور گەرله شنوو لا جانیم
گەر له گوران وجهان بگلو ئه گەر سورانیم
گەر بروکی و بەکری ایلی دزه و بوتانیم
هەمو وەك یك بە بەشی سودو زیانی ناون

اهلی هەولیرو سلیمانی و ئەکره و زاخو
رانیه و پژدەرو چوارتا وروانداز تا کو
خانقین مەندلی وآمیدو جی ژەنگار و چی خو
کفری‌یی‌و پروی وو کرکوك وهەلبجەوشاهو
باوك و دایکیان یکه یك ملتن و یك ناون

گەر مسلمانن ود یانین و یەزیدی و گەبرین
زادەی یك رەگەزی و تیرە وو شاخ و بەفرین
وەکو پینج تامکی دەستیکی زلین تادە مرین
گەر وەفر بین له دەمی دوژمن ئەدەین‌وەك‌بەبرین
ور بلا وبین و بە تەنیا وە شکیین سوتاون

شیرین ئەم شاخ وچیایانه یی کورد جیانه
کوردین و خاکی وطن دایك وهم باوەمانه
آسکی ئەم چیمه نی کوردیە نو وطن چاوەمانه
بازی هیلانه بلندینو وطن باللانه
همو پەروەروەی ییك دایه نی خاك وآون

ئەی شەمال هەلسه به بەدخواهی خراب بیر بلی
دەست له خاکی وەهە پیروز نەدا لا چی هەلی
سەری پیاوانی له خوینا وەتلی به لکو گەلی
نەشی‌یی دەست ور پژبی له چیاو بکو و گەلی
خو مەرنجینه برو تاکو له وەقدا ماون

ناوی ئەم خاکانە ئەوانه نی یه کوردستانه
جیگە یی به برو هوژبر اژدەرو هم شیرانه
خاکی ئەو چاترو خوشتر له همو خاکانه
ناوی آزادی کورد تیشك بەرو دەخشانه
ئەمه کوردن نه کسه غیرن که بلیی زور خاون

ئەمه خاکیکه که فەرهادی هەبو بو آشور
ئەمه خاکیکه که خاوەندی مسریر بون وغیور
ئەمه خاکیکه همو پیاوی دلیرو بازور
بو همورابی هەبو کاوه و بو ظلمت نور
ملتی خاونی شان وشرفن مەر ماون

برزی و زیرەکی ئەم ملته هیشتاماوه
دین وآین و کتیب بونیان هیشتاماوه
بی شون تەختی سلیمانی یان هیشتا ماوه
گات و آوستە وو دین کوردیان هیشتا ماوه
خاك و خولی ملت و آثارو نیشانیان ماون

روژی روناك ورەش و تالی وخوشی زورمان دیی
جەورو کوشتاری همورابی و سکندرمان دیی
ظلمی آشورو سکیت کلدی و بیز انسیان دیی
دەشت وصحرایی عرب پر له لەش و خوینیان دیی
ظلمی چەنگیزیی بو تیموری که چیشت هەرماون

خاکی ورد ماتی کورد شوروشەری زوردیوه
گەلی جار چول وچیایی پر له که لەش پەستیوه
کیله شین شاهدە ئەم خاکه بە خو بی رەنگیوه
تورك و تاتیك وعجم کوژتنی کورد هەرژیوه
گەلی شاهانی جهان بەم غمەدل رە نجاون

شیبری کورد ژەهره له هەر شان‌وسەری گەر بکەوی
دە کوژی بوچی دە کا بیتو ئەگەر سەر نه نەوی
أموی و فاطمیەکان چیژ تیان ئەگەر راستت ئەوی
صفوی‌و قاجاری د بتیان ئەتوش گەر بتەوی
خو دەبزوینی دەلیی کورد شهیدا له ماون

# بردیلك

— ژ عبد الخالق اثیری کرکوکی ره —

ای برا شهبازی اوجی فن وهم عرفانی تو
صد وکي ابن الاثیری گوری بو قربانی تو
تیری خوشخوانی تهٔصپتان جان ودل‌ای کاکی خوم
ناتوانم ازخوه راگیرم ل‌بر خوشخوانی تو
باغ و بستانت خوشن سیرانی لی کردم سحر
جنة المأوی یه شاخك از رهز و بستانی تو
زاب و دجله آقی خابور وفرات هرلا دچی
آقی سوری بو عراق أز کانی کردستانی تو
فارس وروم وعرب محتاجی دخل و دانی من
تاجری دنیا حمو محتاجی شغلی وانی تو
دین وملت هرد و فوتان کس لِ وان نابت‌خدی
هیچ ل‌خوهوشیاری نابن عالم و شیخانی تو
دائما جهل و نه‌زانی بو خوه اثباتی أکن
منفعت هیچ بو مه نادن شیخ و مامستانی تو
هیتوانی مکتبا من گر سرفرازی ببن
دی‌بژی آن دولتا ساسان وهم کیا نی تو
صد صلاح الدین و پی صد وه‌ك ابی مسلم هبی
فائیده هیچ بو مه نادن سطوت وشاهانی تو
گفت و گو یت پرخوشه‌هر چونی فرمانت کری
نسبتا آری بسه بو عن عن وعنوانی تو
لازمه ام هول بدن بو اتفاق کردی مه
بختی بو زازانی من هم سوری بو بابانی تو
هیوی دارم گو خطانه گرن ل خوشخوانم چکو
از نه میدانم بابیم برشیوه و گورانی تو
لی سلاڤان از دکم دائم لا کرادی عراق
لا جرم دوست وهڤال وهوگر و جیرانی تو
گرمها پائیزی پاش بی ب خیر و پر خوهشی
لی هبن پاره لِ کن من دی ببم میوانی تو
از جگر خونم ل دردان لو ل من صوتایه دل
ملهما در دی د لی من لاوك وحیرانی تو

جگر خوین کردی

که دانیشتوانی خوارو له گفتگوی دانیشتوانی سه‌رو تی نا گات وبه طبیعت حال هه‌تا له‌یك تی گه‌یشتن که‌م‌بیت دل له‌دل دور ئه‌که‌ویته‌وه ویك بون گران ئه‌بیت .

لام وایه پیش هه‌وشتیك وظیفه‌ی خوینده وارانی کرد هه‌ول وته‌قه‌لادانه بویك خستنی لهجه‌کانی زمانی کوردی . به‌لای منه‌وه گوڤاري هاوار ئه‌توانی له‌م بابته‌وه یارمه‌تیکی باشی بکات . وه کو :

بی گمان له‌زمانی کوردیدا هزاران کلمه‌ي واهه‌یه که له‌هه‌مو لهجه کاندا معنایان یه‌که وفرقیان نیه . هتا بتوانریت مقالات به و کلمانه نبوسریت که مشتر که وجگه له‌وه‌یش مثلا هه‌ندی کلمه‌ي لهجه‌ی بابانی تی بخریت که ئه‌مکن بیت سوران وبوتان به قرینه تي بگه‌ن و دیسان هه‌ندی کلمه‌ی واي کوردستانی شمالی به که‌لك بهنریت که کورد جنوب بتوانن به قرینه له‌معنا که‌ی حالی ببن .

نوسینی فرهنگو که زور به که‌لکه ، به‌لام اگر معنا که‌ی به کلمات‌مشتر که ( یعني ئه‌وانه‌ی که‌مالی هه‌مو کورده و به تایبه‌تی هی لهجه یك نیه ) بنوسریت‌استفاده‌ی گه‌لی زیاتر لی ئه کریت .

من امیدم وایه اگر هاواری خوشه‌ویست بومدنیکی مناسب له سه‌ر ئه‌م ریگایه وه بروا اوسا لهجه یکی مشتر کی کوردی دا ئه‌مزریت وبو له‌یه‌ك تی گه یشتن مجبور نابین به که‌لك‌هینانی زمانیکی اجنبی .

ابروت

دسرهیل وبن هیلا من ره درباس دبون • أز دجهی خوه ده
مام پشتی دمکی دنی قر یبـا و کربو هر کس نقست • تنی
دنگه کی بـِ شین ژ دجلهٔ دهـات• سرکی من دور آلین
خوه چاڤکر لِ نیاران نیشان نه مابو • هین تیرژا نوری ب
حمدی خوه شه‌ول ددان • ژبر کو دومامین من ژی دوی
عردی ده ڤشارتنه من زانبو کو کی‌شیر ل ور رادزی •••
« شیخ سعیدی کال » •من هیدی هیدی خوه گهانده تیر
ژی •ڤیجا زمانی‌من‌هانبو گرتن نزانبوم چی بیژم• سرکی‌من
ودل لبر هڤدا کاربن نه دبو ، من نکاربو دو پرسان بجه
بکم • ولو دست بست بری من ل تیر ژی وراوه ستیا بوم •
بستکی بشونده‌زمان حبکی بگر کت ومن گوت :

— ای کمبا قومیتا من شیخ سعیدی کال ! ته •••
ته •• ته زنجیرا دیلی یا قومی من ب زخمیادل ، پرانیازانین
وراسنیاخوه قناند • وکاشیر کو دقفسی ده بدر کڤه -أڤ
قومی کوچار صد وهنده سالن خوه ژبیر کربو ، خوه وندا
کربو ، بی ناڤ وبی زانین مابو ، که تبو خه وامرنی ،دوی
خه ربده أو شیر ته هشیار کر • نیاری کو دخواست مه
وناڤی مه وزمانی مه ژدنی هلینه ته ددستی ویده‌لیداوشکاند•
ژروژا کوته سری دانیه وڤرده کیژان کود چی بکه‌ولِ
کردستانی چی ببه حمو کرین ته نه چی کو بنگهی وی‌خانی
ته ڤدا وهیمی وی ته دانی •

حیا کو دنی هبه او کسین کو دبن ناڤی کردی
وکردیتی بی ده بژین منتدارین کر وقنجیا ته نه • چی کو
ژوی روژی وڤرده باڤی کردیتی‌بی پاشین تولی‌دی‌هرتوبی•

بنده ژمتتدارین ته کرده کی بچوك ، بی کیره •
ژبر کو یزدان دلی من وك دلین برا ین منی کرد زخم چی
نه کربه ژتشتین بچوك ومزن زو دئیشه • دئیشه لی نه
ئیشه‌ك نخوشی ، ئیشه‌ك أڤینی ••• گیش دبه‌آگر ••
آگیره کی ولو کو جنابی زردشت لـِ بیتشه بونا وی
فدجنیقه ••• جان وجندك لمن پرتاندی یه ، بهنکی نکارم
بی غم راوه‌ستم ، گیش شوات ••• صوتن ••• ژان •••
تاژان ••• تیر ••• وئڤانجن •

ای قنجی خوه دی ! قصدامن : دیتناولیت وڤی عردی
کوژِ شیر ولهنگان‌تژی زیارت کرن ؛ وژڤی‌ژاناد دلی خوه‌ره
ژی درمانك ژِ جنابی وه خواستن بو • لی أڤی تیر ژی‌پرین
من صوتن و کتمه خار ، ڤامه کاتو ژمن ره چی دبیژی ؟

تو دنك چی نه بو • هات بیرامن کوهی نزانن دنی قری یه
وگیش نقستنه ژلوره توجهاب‌نه‌دان• دیسان من کره زاری •

— ای گه وره تری قومی من ! تو ••• توبِ کسرا
دلین ڤان شهیدین لنك خوه وب کولا دلی شهیدین کلاخوی
دکی کو جهابك وکی دلخوازا من بدی •••

دیسان‌ وکابری دنی کر ••• تو دنك چی نه‌ بو • جاردن
بدنگه کی زیز لا بژم •

— أی شهیدی گه وره اپشت میری اولا محمد ! هیمی
هینا کردانی‌یه ! توبِ أڤینا خباتا شهیدین کرّ وسیدخان
وعلی‌جان‌دکی کوهنده‌من بی فرنکی؛یاأزنه‌هیژاپی‌ڤی‌دخوازیمه؟

دیسان توتشت بدرنه کت• ایدی‌مجالا‌من‌وخوه‌را گرتی
نه مابو • فرقاتا گری کتبو قربکا من بِ هیل دنگی خوه
من کره گازی وزاری •

— أی‌هشیار کری قومی‌من ! توب میرانیاددلی فرزنده
واحسان وبِ گورنا برهودکی کومن أڤ قاس شر بژه‌نکی •
جهابك ••• دوپرس ••• دل خوه‌شی بك ••• چی دبه؟
ما أز ژی نه کردم ؟

بِ صح کرنا هرمی‌ناڤین داوی بی ژروژ هلاتی تیرژی
ده دربکی مزن ژِعردی ڤه بو و بکی سری خو بدرخست •
چی بوبونم ؟ کو عزبر آغابی سلوپی یه • من اونامی‌لی وی
أز نه ناسیم وأڤ خبر ژمن ره گرتن :

— برا اژبو خوه‌دي هنده مکه قیرین‌وزارین • ایشڤ
جڤینا مزن هیه کو کس نکابیته نك مه ، ماتوژ ریا خوه دی
کتیه کو ولی دکی یه گازی• هین پر دربژ کی أمی‌خبری
بدن ملکان• دوژه نیزبنگی‌مه یه دی‌چند زبانیان بشینن وب
آگر برا ته دن ولنا ڤچاڤا ته بدن حیا دمری لی ته گنهه
رانه وه‌سته هره مالا خوه •

— هی لو اپیو کو انوژ آگر دترمی‌ما آگر ب من‌چی
دکه ؟ •• آگری کو خوه دی ایخستی دلی من هکه بردم
بلادوژه‌ژی‌بترسه کو أو دی بی زبانی بمینه• ل وی بشونده

# بیاسکە جگەر خوین

ژ عثمان صبری افندی رە

بگوری بم ژبوتە ای برای من توکانی
ژ دوری ڤەتە دە ستی خوەدِ نیڤت دەستی من دانی
ب من؛ تەدو دستین بی چپ وراست ای برادر
بلی هردو قوی ژارن دیك لاشی گرانی
مە پرسی دەردی دەرمانجان ژ چرخا أتلسا ژور
نە زانی بو ڤان دردە بلی لی مە خزانی
بلی زیرە بلی زیرە بلی زیرە بلی زیر
خوە دانی وی جهان گیرە بلا کر بت دخانی
ژبومە نە عقل فیدە دکی نە خوندنا پر
ژبومە چو دڤینن دا ژ ترسان بدنە بانی
فلك قابە مرم ایرو ژ دنیا از هلا تم
بکوا خوە ب چرخا خوە تە داخوازا مە نانی
جگرخوینم مرم از چوم ژبوەو صبری یك‌دا
اری همبری کردە وە لی بی وە حی اسمانی

جگرخوین

٢ — کە فەر هنگ ( قاموس ) آمادە کرائە بی شر کتیکی مطبوعات بکری وآثاری کون وتازە چە ئە دە بی، اجتماعی، زراعی، صنعتکاری، تجاری بە کیتیب بنو سری وغە زەتە و کوڤار بلاڤ بکاتە وە بە نە رخیکی‌هەر زان، ابی لە بی‌رمان نە چی بونی چاپ وزەنگوغراف جداً پی ویستە بوموفیقی أم شز کتە .

٣ — کومە لی بژار چە هی خوارو وهی ژوورونە بی سەر نج بداتە ئەوحکیانەی کە کررتە، و پر معنایە واصولی ایلای توفیق وهی بگ وبدرخانیکان لە بك بدا، ووە ختیك ئە توانین بە لاتینی بنوسین کەسەر بە ستی ببین وادبا وشعرا کانی کورد بلاو بنر بنەوە واوانیش ئە بی قدری ئەوتشجیعە بزانن ووار لە کولن آلو چاوی رەش بهینن ...
خو بدە نە ئە دە بیاتی روژ آقابە کانیش ... ابتر حرمت بودوستە کانی کوردی .

لازیکی کورد

# لِکور نستانك آمدی

ایشف ژشفا پر تر بهنا من تنگ بو بو. دیسان دردی من سری بدرختبو. شاغین مورل کولامنا دڤ برنخون دیاربون. تاژان وڤانجان ژدل خوە دربژی کلوخ د کر. ط،زین ساردبنی لنگان حیا قوتی سری دچون. قفسنگ لمن تنگ بو بو وتیرادلی من نە د کر. وکی نخوەشی کوتا لِــ سری ددە من دخواست جلین خوە بچرینم. خو بدانە کە سار وزلقوك ب أنیا من کتبو. من لِ دردی خوە کربو دەر، لی مکوناوی تنە بو. کلا گیهانا ولیت ... کلا گیهانا ولیت ...

من داخوە ورابوم — ناڤبرا مالامە وبحری دوصد گاف هبون — برڤە بحری چوم ( هرجار کو أف کلا لمن رادبون أز دچوم بر بحری. ژبر کو دردین من ووی بهف دمان کو تمی بر پیلە، حوبنی یا من پی دهات ) هیدی هیدی دچوم گومینا پلین بحری، دنگین ویرویر وکان وزاربنا طیر کی شفی دزك هڤدە ولك لورکا دیان لبر در گوشی بر جانی من شادبون. دلی من فرە وخوش بو، لی کلامن پر تر رادبون، لمن ولو قویمی کو پی بن من پری جار ند گیهان عردی. چنگین من رادبون. وی گافی من فرا طیران دخوازاندن. ب شینا یزدانی گەورە باکت بن چنگین من وفیر بیام. دفیر بیام لی زو کا ژ طیران وبالافران وکاملکان دفرم. ب وی چوبنی دساتکی دە من دکاربو دمر حمودنی رە درباس بم. جی بی أز بچویامابی نزینگ بو دبهنکی دە فلسطین، شرق الاردن،سور بە درباس کر ولِ تالامری کانی بی ل سنوری ولیت راپریم. دناڤبرا میر دین وویران شهری رە من خوە گیهاندە سر دیار بکری. لی گافا گهشتمە دیار بکری لِ هیلادری چیان تیر ژەك‌نوری وکا کسك سوری لی ستور بیرچاڤین من کت. چاڤین من لی دلیان هنەکی أز ور مات مام باشی من.خوە لی گرت وچوم. گافا گهشتمە تیرژا نوری وکا پر پر وکی کو پر دشە وتن أز دژوردا هاتمە خار و کتم. هین ابڤار زو بو. جهی أز کتی لِ پیشبری راوە ستە کا بالافرین رەمان بو. کلوس ( عسکری تورکو )

سال ٢
هژمار ٢١
دوشب
٥ حزیران ١٩٣٣

# هاوار

السنة ٢
العدد ٢١
الاثنين
٥ حزيران ١٩٣٣

كوفارا كردى * مجلة كردية

## صحبتى

### لـ بو بكبنيا زمانى كردى

نقيسه ڤانى مه ئى دلال وهيژا هقندى صورى دهژمارا هاوارى آشانزدهان ده ژبو يكيتيا زمانى كوردى انكيتك ڤكر بو .

لگورا شرطين انكيتي جهاب حتا سرى گلانا ڤى سالى بهاتانا هنارتن ودِ هاوارى ده پيدا بلاڤ بو بوواناً.

بلى چند جهاب گهانه مه . لى نه أو چند كومه هيڤى دكر . نمازه ژ عراقى ژ جهابا ژيرين پيڤه تو تشت نه گهشته كوڤارا مه . ژبر كو هاوار ژ زوڤه يه ناچت عراقى و دستى مه ژ كردين عراقى بو يه .

أڤ شش مهن ، حكومتا عراقى ناهيله كو كوڤارامه بكڤت اردى عراقى . حتا نهو ، ب هڤى يا كو حكومتا عراقى امرى ممنوعيتى راكت وو كه برى دستورا كوڤارامه دى بدت ، مه دنك نه دكر . مه چند جاران مراجعت كر، مه ژوان ره دازانين كو هاوار كوڤار كه ادبى يه وعليهدارييا عراقى نه كربه وناكت ژى . مه خوه ست ، ايروژى ام دخوازن ڤى مسئلهيى بر فنجى ودلخوشى صافى بكن وبهڤت مكڤن . لى هكه نه بو ، هنگى أم ژى فكو و گوتنا خوه سرڤى مسئله يى بيژن . لى ئيدى بلا له مگرن ، مه بهنا خوه ، شش مهان فره كو . هروكى بخوه دبيژن ، سوج ئى دستپيكرى يه «البادى اظلم» .

نهو أم ڤگرن سرانكيتاخوه . هروكى مه دهژمارا شاتردهان ده گو تبو ام جهابان بِ ريز وتاريخى ڤه بلاڤ دكن . أڤه جهابا پيشين :.

## بكبنيا زمانى كردى

### — ١ —

١ — كومهلى بژار : — بو پاك كردنه وەى كوردى له كلهى بيگانهئهم كومهلهبهباش ئهزانم؛ كه ئهبى خوبندهواره بى فرمانه كانى وبه تايه به تى دەوله منده كانيان بى كەن .

كومهلى ؛ چه هى بژاربى ، چه هى درونيه بى به پاره فرمانى جى به جى ئه بى ؛ پارەش بەپيتاك ، تمثيل پيانقو ؛ زورباش پيك دى . فرمانى أم كومه له أبى بكرى به پينج كەرته وه .

ئه وانهى كه كلهى صنعتكاران ئه دوزنه وه
ئه وانهى كه = تجارت كو ئه كنه ده .

| » | » | زانستى | » |
|---|---|---|---|
| » | » | زراعت | » |
| » | » | ايشوكارىدائرەى حكومتى كو ئه كنه وه | |

هه مو به ليكى أم كومه له پى ويسته به لادى دا بگەرى وكلاتى به تى جوانى كوردى بدوز يتهوه وچه په ليك كليمهى جوانى دوزبه وه خه لات بكرى كورده كانى خوارو به جيا ؛ براخوشه ويسته كانى ژووروش بەجيا بو پيدا وخلق كردنى أم كومه له هه ول بدەن هەر كومه له به جيا كوڤار بكى ئه ده بى ده بهينى ، معلمانى كورد ئه بى ببن مبشر بكى باش بو بلاڤ كردنه وەى ئه وكلماته كه به كوڤار بلاو اكريته وه دامەز رينه رەكانى ئەم كومه له پاش خەريك بونيكى زور قونغرەيك بكەن بونوسينى قاموسيك وهەر چى كلاتيكى جوانى ژوورو وه خوار و هيه هه رلى بژيرن وبيكەن به قاموسيك .

## اشتراكات مجلة هاوار

في سورية وتركية والعراق وبلاد العجم وبلاد القفقاس

| | | |
|---|---|---|
| عن سنة واحدة | ٥٠٠ غروش سوري — ١٠٠ فرنك | |
| عن ستة شهور | ٣٠٠ غروش سوري — ٦٠ فرنك | |
| عن اربعة شهور | ٢٠٠ غروش سوري — ٤٠ فرنك | |

وفي غير هذه الأقطار

| | |
|---|---|
| عن سنة واحدة | ١٥٠ فرنك |
| عن ستة شهور | ٩٠ فرنك |
| عن اربعة شهور | ٦٠ فرنك |

المراسلات يجب ان تكون باسم صاحب الجريدة : الامير جلادت عالي بدرخان دمشق — حارة الأكراد

سالا ٢ — هژمار ٢١ — دوشب — ٥ حزیران ١٩٣٣

السنة ٢ — العدد ٢١ — الاثنين — ٥ حزیران ١٩٣٣

# هاوار

## کوڤارا کردی * مجلة کردیة

### نیخستیین کوڤـای



١٣٥٢ ه | مطبعة الترقي بدمشق | ١٩٣٣ م

SAL 2
HEJMAR 22
ŞEMBIH
1 Tîrmeh 1933

# HAWAR

ANNÉE 2
NUMÉRO 22
SAMEDI
1 Juillet 1933

## Qovara Qurdî * Revue Kurde


### Têxistiyên Qovarê



### Birê Frensizî




Çapxana Tereqî
ŞAM — 1933

## Qirîyarîya Qovarê

Ji bona Sûrîya, Tirqîya, Ecemistan, Irak û welatên kevkasê :

| | | |
|---|---|---|
| Salqî | 500 kirûş-sûrî — 100 frenq | |
| Şeşmehqî | 300 kirûş-sûrî — 60 frenq | |
| Çarmehqî | 200 kirûş-sûrî — 40 frenq | |

Ji bona welatên din :

| | | |
|---|---|---|
| Salqî | 150 | Frenq |
| Şeşmehqî | 90 | Frenq |
| Çarmehqî | 60 | Frenq |

Her tişt bi navê xweyîyî têne şandin :
Mîr Celadt Alî Bedir-Xan
Şam : Taxa Qurdan

## Abonnements

Pour la Syrie, la Turquie, la Perse, l'Irak et les pays du Caucase:

| | | |
|---|---|---|
| 1 an | 100 | fr. |
| 6 mois | 60 | fr. |
| 4 mois | 40 | fr. |

Pour tous autres pays:

| | | |
|---|---|---|
| 1 an | 150 | fr. |
| 6 mois | 90 | fr. |
| 4 mois | 60 | fr. |

Adresser toute demande au directeur propriétaire: Emir D. A. Bedir-Khan
Damas: Quartier Kurde

ŞAL 2
HEJMAR 22
ŞEMBÎH
1 Tirmeh 1933

# HAWAR

ANNÉE 2
NUMÉRO 22
SAMEDI
1 Juillet 1933

Qovara Qurdî * Revue Kurde

## SEHîtî

*Le bo zmanê qurdî*

— 2 —

Weqê Hawara şanzdehan gîha destê min û min dest bi xwendina wê qir d.t qo t.de bendeq liser yeqitîya zmanê qurdî heye. Pê geleq şa bûm û min dil qir ez ji fiqra xwe di vê babetê de xuya biqim. Ezê ji gotina xwe bi çend pirsên biyaniqî dest pê biqim.

« Major Soane»yeqî ingilîz qo di nav Qurdistan û Ecemistanê de geriyaye û hinî zmanê qurdî û farisî bûye liser Qerdistana jêrîn qitêbeq nivîsandiye. Major di qitêba xwe de bi zmanê qurdî û bi zarê muqri jî mijûl dibe. Ev e gotînên Major Soane.

«Yên qo zmanê qurdî rind dizanin qêm in. Ji lewra hineq debêjin qo ev zman ji zmanê di farisî û erebî hevdudanî ye, piranîya pirsên xwe ji wan girtine. Hineqên din dibêjin qo ev zman zareqî farisîya qevn e, û pêş de ne çûye. No, her du gotin jî ne rast in. Zmanê qurdî zmaneqî qeleq qevn e, ewçend qo ji zmanê farisî ê nuh ji qevntir e. Zmaneqî tequz, bi zmanazineqe binizam. Ji hêla din zmanê qurdî ne qetiye bin hiqmê zmanê erebî weqe farisî û pirsên arî ên xwerû winda ne qiriye. Lê farisî ev winda qirine û dewlemendîya xwe bi pîrsên erebî aniye pê.

Di nav zarên di zmanê qurdî de zarên paqtir û xwerûtir zarên muqri û qurdmacî ne. Ev her du zar geleq nêzîqî zmanê zendî, zmanê Avêsta ne.»

Carqê hevaleqî min ji min re gotî bû qo zarê murqri zarawaqî zarê lolo ye. Ji xwe qurdîya lolo zarê qurdmancî ye. Hawar jî bi piranî bi zarê qurdmancî derdiqeve.

Niho min divêt ez fiqra xwe liser yeqitîya zmanê qurdî bidim zanîn:

1— Zmanê qurdî bi bijartina pirsên qurdî. ji hemû zaran, û bi xistana wan li şûna pirsên biyanî qo qetine nav zmanê me (tirqî û erebî).

2— Berî her tiştî divêt em zareqî ji bo xwendin û nivîsandinê bibijêrin, piştre pirsên zarên din bêxin nav wî zarî

3— Zmanê qurdî bi awayê di jêrîn pêş ve diçit û biser diqevit:

A : berhevqirina şihr û pendê di bapîr û qalan, da qo qanîyeqe edebî biqeve destê her nivîsêvanî.

B : danîna dibistanan di nav bajar, gund û eşîran de.

C : wergerandina qitêbên biyanîyan ên hêja li zarê xwe.

D : belavqirina rûjname û qovaran.

F : danîna du civatên cihê, zanistî û dînî. Ev her du civat bi hilbijartina pîrsên qevnar û bi peydaqirin û hevedudanîna pirsên nuh dê mijûl bibin.

*Elî Seydoyê Gewrî*

## Sehîtî

— 3 —

Di hejmara hawarê a şanzdehan de liser sehîtîya zmên sê pirsîyar ji qurdên xwenda qiri bûn. Bi van çend xêzên jêrîn gotina xwe û bi geleq silavan ve peşberî hingo diqim.

1— Yeqîtîya elfabêya qurdî.

2— Heçî xortên qurdan yên qo îrû

bî zmanê qurdî re bendewar dibine ji qurdên her welatî xorteq bijartin û ji van xortan civateqe zanistî anîn pê.

3— Di vê civata zanîstî de berî her tiştî ferhengeqe gewre, di pişt re qitêbên qevnar û nûjen, temamên wan liser hemû zarên qurdî bilav qirin û di piştre bi yeqitîya zmanê qurdî mijûl bûn.

Bi vî awayî heya deh salan di xwendinê de yeqîtî û di axaftinê de nîzîqayîyê hêsanî dibûnim.

Xwedê vê bendewarîya Hevindê Sorî bi miletê qurd re dirêj û berxurdar biqe.

*Osman Sebrî*

# Nivîsevan

Jîna paîzê bê reng û tam e, ji lewre dema werihan û mirinê ye.

Rûjên cûn, ezmanên bêroj, Şevên reş çikas nexweş in.

Bayê qûvî liba dibe, sih qûr û sar e

Ewrên giran û, tarî di ezmanan de digerin sihên wan diqevin dilên mirovan û dilê wan tehl diqin.

Key nexweşîyeq ji xewê radibe û li dora dinyayê de digere.

Di paîzê de sistîya jînê, zayîn û mirin diqevin pêhev. û insan ji xwe re dipirse:

— Ma ez ji qû hatim û diçim qû?

jîn çiye? Ew hatin û çûyîn ji bo çi.

Rûjêqe ji rûjên paîzê dilê Iblis teng bû ji xwe re got ezê herim gornistanê yeqî ji miriyan ji xewa wî hişyar biqim û pêre baxêvim û weq gotina xweqir û çû gornistanê û ser tirba nivîsevaneqî seqinî û ban wîqir û got:

— Ho! guhbide min! ji cihê xwe rabe! ji gorinê dengeqî kebe lê vegerand?

Ji bo çi ezê ji tirba xwe rabim.

— Divê tu ji tirba xwe rabî!

— No ez ji tirba xwe ranabim!

— çima?

— Ma bêje tu qî yî.

Tu min nasdiqî

— Waliyê tirqo?

— Ha... ha... ha no.. ez ne ewim.

— belqo tu qomandarê esqeriyî

No.. no.. te dîsan sehneqir.

Ma qî yî bibêje...

Ez 'blîs im:

— qo wisa ye baş e baş e, zûqa têm

Qel ji cihê xwe keliki axê xwe veqir û hêdî hêdî cendeqê zelamî ê hestî ango keltaxê wê ji erde derqet

Iblîs jê re got:

— Rûja te xweş be. Nivîsevanê lê vegerand:

— Ez niqarim selawa te li te vegerînim

Mirî geleq nizm digot û dengê wî ecêb bû key du hestî hev digemirandin.

Şeytên got:

Mêze kisûra min meq e min nedîviya ez selawê li te biqim.

—Xem tune.. lê dixwazim bizanim..

Te çima ban min qir?

— min ban te qir ji lewre min ji xwe re digot, emê herin bigerin!

—Çaqe.. ger ji hewa ne hevkas spehi ye.

— Tu ji sermayê natirsî?

— No. bi xwedê eznatirsim.. Min di jîna xwe de geleq serma hilanî.

— Belê... niho tê bîra min, te serma hilanî, ne sax qetî û wisan mirî.

Li tenişta hev bi rê ve diçûn.

Baraneqe hûr dibarî û bayeq dihat li hestîyên ser û perasûyên nivîsevanî re derbaz dibû qo êdî dileq tê de nedîlivî. Ji qortiqên çavên nivîsevanî roniyeqe heşin derdiqet, diqet erdê û rêya Iblîs rondar diqir.

Nivîsevanî ji şeytên pirs qir?

— em diçin bajêr?

— Qo dixwazî serseran. qeyfa te tê?

— çawan nayê

— ma di bajêr de çi heye qo nîzîqî dilê te ye.

— mirov

— Çima

— Çi bêjim... ez çikas ji bo wan xebitîme.

Iblîs diqeni û qeyfa wî dihat û digot

—Insanê reben!

— hem reben hem bextiyar

Iblîs milê xwe dikelikand.

Ji gornistanê derqeti bûn, li ber pêyên wan de rêyeqe pehn xwe dirêj diqir, di her du rexên rê de avahiyên mezin bûbûn rêz. Rê tarî bû, roniya fanosên rê hindiq bûn wê qêmanîyê, qêmanîya roniya dinê eşqere diqir.

Iblîs dîsan pirsqir...

— de bêje.. di gorinê de tu çawanî, tu çawan li xwe dihesî.

— Niha qo ez tê de hinbûme, ne xirab e,rahet û bêdenge, lê dizanî despêqê de giran û geleq dişwar bû. Wî qerê girêdayî qo tabûta min hismar qiri bû bismareq li mejîyê min de jî qutabû.

Dizanim qo ne tiştiqî giran e lê ez pê geleq aciz dibûm.

Min ji xwe re digot ew bi kesdê wilo çêbû, min bi eklû mejîyê xwe işên pir zelaman xirab diqir dixwestin mejîyê min jî xirab biqin, û paşê qurm peyda bûn, ew jî îşeq bû. Ez hêdî, hêdî dixwarim.. geleq hêdî. Iblîs digot:

— gotina te ye.. wisa dixwin, ma çi dixwazî, ew goştê tehl û weq zirav jî zû naye xwarin.

— Lê dizanî cendeqê min jî ne tiştiq bû, goştê wî geleq qêm bû!

— Tirq ji goştê we zeyde ir hezdiqin ne holê ye?

— Belê.. gotina te ye. ma çawan nizanim, ew goştê me û gundê me û her tiştê me hemî bi hevre zu dixwin!

— Pehîzê de gorin çawa ye, hêmî ye?

— Belê.. ne bê hêmî ye, lê mirov lê fêr dibe. Lê heq rastîyê dixwazî ez ji hemî tiştan zeydetir ji wan ehmekan aciz dibim qo tên û di tirban de digerin û ser tirba min de radiwestin.

Lê dizanî ez nizanim ji qî wextî ve ez mirî me.. êdî wext çi ye sehnaqim

— Ev çar sal in tu di axê de yî nizîqe bibin pênc.

— Holê ye? di vê navbirê de sê zelam hatin ser tirba min rawestan yeqî ji wan navê min xwend û digot naveqî wisa min tucar ne bihîstiye. Niq dilê min di vê gorinê de qes veşartî tune.

Çawa bibêjim dilê min geleq aciz bû, ez çend salan ji bo welatê xwe xebitîme, piştî vê xebatê yeq têt ser tirba min û dibêje, min navê vî zelamı tucaran ne bihîstiye û ji gotina wî derdiqeve qo ez di gorna xwe de ne veşartîme.. ma tiştên wisa tên qişandin.

Yê din navê min nasdiqir lê wî ji digot qo min xulamîtiya tirqo qiriye bila cihê min bibe dojeh. Yê paşî digot ew çikas bê ekl bû jina xwe ji bo serxwebûna Qurdistanê xelasqir.. Her tengiyê de ma û wisan bê pere mir, qitêbên wî niho di gund û bajarên Qurdistanê de tên xwendin, herqes hej wî diqe lê mirî ji pesnên xelqê û ji hejqirina wan bê hay e.

Diviya bû jina xwe di xweşiyê de bibirîne.

Wextê qo qetin nav bajêr de Iblîs guhdariya dengeqî qir û ji nivîsevanî re got bibihîse.

Nivîsanî guhda û bihist şagirtên dibistanê yeq ji şihrên wî distiran, pê geleq dilxweş bû û dîsa dest meşê qirin.

Xelq li ber qitêbxaneyên mezin qom bû bûn, qetin nav wan de û nivîsevanî dît qo yeq ji qitêbên wî bi herfên ziv û zêr çapqirî peşberê xelqê de ye, xelq bi çavên geş lê dinêrin û herfên qitêba wî weq stêran diteyisin.

Qo Iblîs şahiya wî dît pê dilxweş bû û jê re got:

— dixwazî em herin dûrtir; nivîsevanî got;

— No.. naxwazim, dixwazim bizivirim ser tirba xwe; min dît qo ji bo min mirin nîne.

Vegera xwe de dîsan dibihist qo zaroyên Qurdistanê şihrên wî dixwînin.

*Dr. Qamiran Alî Bedir-Xan*

# Çarînên Xeyam

Delala qo dilê min jê re har bû
Ciheq dî de ji xemê re giriftar bû.
Çawan diqarim pê dermanî bigerim
Dermanqerê me nesax û jar bû

Ber çavên qûrbînan çi spehî çi qirêt
Warê dilqetîyan çi dojeh çi bihuşt
Sitarên bêdilan çi etlas çi caw
Bin serê dilqetîyan çi balişne çî nivîn

Gava hevîna pêşiyê ez lihev dam
Ji min re a berê dersa hvînê dam
Piştre ji parîyê zêrê dilê min
Çêqir mifteya gencîneyên manan

Ev qarwanê jinê ecêb dibore
Balkide dema şabîyê dibore
Meyger xema xavîyan meqşîne
Bîne piyanê şev dibore

Dilê min tucar ji zanînê bêpar nebû
Hindiq man veşartî qo ji min re qar nebû
Di jîna xwe a heftê û du salê de
Jîna min borî ket li min aşiqar nebû

Xwe bigire ji giyanî tuê dûr biqevî
Li paş perdeyê weşartîyên Xwedê qûr
( biqevî
Şerabê vexwe tu nizanî hatiyî qû
Dilxweş be, tu nizanî dê biçî qû.

Şerabê vedixum lê serxweşîyê naqim
ji bilî piyanê destdirêjîyê naqim
Dizanî kesda min ji şerabperestiyê çi ye
Da qo weq te xweperestî meqim

Dinê ditî û her çi ditî hîç e
û her tişt qo gotî û bihistî hîç e
Peqe dinê ser bi ser geriyayî
An ji goşeya malê de rûniştiyî hîç e.

Rûja qo hespê ezmanî tê de zîn qirin
û Miştêrî û Pewîn rewşa wî qirîn
Ji dîwana kezayê nesîbê me ev bû
Ma gunehê me çi ye kismetê me eve qirin

# Ibret

Emînê Ehmed hate quştin

Kederê du mehan e, Emînê Ehmed, bi naveqî din Emînê Perîxan bi destê tirqan hate quştin.

Emin axa yeq ji axayên welatê me bû. Mina axayinen din ji tirqan re xebateqe mezin qiri bû. Digel hevalên xwe çeqhilgirên eşîra xwetda bû hev û çû bû liser rehmetî Şêx Seîd efendî. Piştî qo Şêxê rehmetî hate bidarve qirin Emin jî weq axayên din baz da û hati bû nav qurdên Cizîrê.

Pas çendeqê tirqan efweq belav qiri bûn. Emin û çend hevalên wî her tişt ji bira qirin û vegerîyan çûn ber destê roman. Wan yeqo yeqo ew axa winda diqirin. Tenê Emîn ma bû. Vê paşîyê dora wî jî hat û li ber çemê Bişêrîyê bi du beriqên malxrab hate quştin.

Qurdino! de ji xwe re ibret bigirin. Eve qurd dibêjin: rih dibe bost neyar nabe dost.

*Cegerxwîn*

---

Berî qo navê te ji dinyayê biçe
Vexwe şerabê xema te dê biçe
Qezîyên delaleqê ji hev biqe
Berî qo laşê te ji hev qeve

Sernijdevanê rindên xerabat ez im
Ji gotinên bê cih gunehqar bûyî ez im
Ê ji vexwarina meya zelal bê xew mayî
û bi xwîna qezebê lavelav qirî ez im

Gulê got rûyeqî ji rûyê min spehitir nîne
Kevkas westa bûna gulavgirî ji bo çi ye
Bilbil bi zmanê halê xwe got
Ma ji bo qenîna rojeqê qî saleq negirî

Yeqî ji kehbiqeqê re got tu serxweş î
û her gav di dawa yeqê de rewş î
Jinê got: melayo! herweqî tu dibêjî me
Ma tu weqe xwe yî ?

*Dr. Qamiran Alî Bedir-Xan*

# Tarîxeq

Sala hezar û sêde hem çel û çar û yeq ro
Rabû ji kewmê qurdî siltanê textê xisro

Bidîn, mal û miliyet bi ılm û iz û hiqmet
Şêxê terîk û irşad ji nifşa qurdên Palo

Ev Rîstemê zemanî Behramê wextê me bû
Ji çar mehên buharê tirqan digel wî şer bû

Çend keymekam û walî girtin di vê buharê
Tirqan diqirne kîrin: emanî ji destê qurdo

Pir qirin hileqarî tirqan di kewmê qurdî
« Hey ! » dane şêx û axan makûl hem ji (mîro

Ev tevde çûn Hewarê wan xwe bixwe (hev quştin
Li ser xwe. qirin dewlet qurê xunxwa (Holaqo)

Sed Şah û axa û mîr quştin ji kewmê qurdî
Dayê selaê danîn hem qindirê weqe mû

Zaza fena pilingan bi şûr û dar û gopal
Bi dengê milîyetê kirîn didıne tirqo

Bi sond û ehd û îman rabûn digel vî şahî
Berê xwe dane roman gazî qirin «îro ro ! »

Dengê tifeng û topan diçûn semaê banî
Xun bûn rewan ji xortan nîl û firat man (co co

Hineq ji qurdê ehmeq xaîn dibûn didilde
Ax ! ew bedoê sersem, axî ew bê bavê kuso

Wan şexê me girtin, derdestî tirqo qirin
Wê rojê çel mucahîd xistin şerîtê barû

Zaza Qurmancê jorîn heta Cezîra botan
Agir bi wan ve danîn manendî nift û penbû

Pîvaz çi sor û qewr e her tebhê wê heraret
Qurmanc çi dest û dijmin dujwarê qurê (Hirto

Mela û şêx û beg ler quştin serê di wana
Liber tifeng û topan manendî gog û qaşo

Ziqê jinan kelaştin zaroq ji wan deranîn
Ew dane her sungîyan wan go «Hewar e bavo»

Pîr û ciwan û bûqan bisqê xwe tev kusandin
Wan şeng û şûx kamet ebr û hilalê rû rûl

Textes et Traductions:

# Besna

Ji devê Ehmed Fermanê Qîqî

Bi şeranî, bi delalî ji min ra dibên Besnayê
Xwedîya qulan û derdayê
Şêrîna liber dilê xortayê
Li min porsorê, porbelayê
Li darê dinyayê tu nemayê
Li mim qedqirî, tabwindayê
Li min qihêla serê tewlayê
Qaxez û nivîştê min windayê
Qetim tora mêrê xerab
Qirim bergîreq, ji bergîrê tatayê

***

Bi şêranî, bi delalî ji min ra dibên Besna (Xelîlê
Bejna min zirav, nava min kendîl e
Meşa min, mîna werdeqên dora çeman
Sîng û berê min sipî ne, mîna çira şîr in
Mîna sêvê Melotê, şevê qanûnan liber (serê nexweşan
Hem tirş, hem tehl û hem şêrîn in

***

Min rebenê, min rîseq diristî ji xuharê
W' ezê bişinim ser hoste Melqo, culhê (bêxwedîya Darê
Bira çêqe ji Amûdê heta ber Enbarê
Bavê min xêrê biqe, xêrê nebîne
Çima ne dam torinê mala Hesen axa
Ez dam Brahîmê Temo, mîna qundê (kelaçan, mişqê ber qevarê

---

Gazî diqirne barî yareb xuda tu zanî
Em mane zar û mehrûm bê mal û (mêr û zaro
Min dî yeqî ciwanmêr qo «ev xeber (me guhqer
Yani (Evin Cîweleq) ev xehera go be go
Dilê min her bû qebab ji êş û derdê (qurdan
Ji eşqê çeşmê min xun bu Nîl û Dicle (der bû

*Evîn Cîweleq*

Nizam bextê min reş bûye, çima sipî nabê

***

Ji min ra dibên Besna, Besna Eminè
Bejna min zirav e, serê gulîyê min şûşè (zîvin e
Bavè min xèrê biqe, xêrê nebîne
Çima ne dam torinê mala Hesen axa
Ez dam Brahîmê Temo, kelaçê Sirêçqê
Çoqa min liser çoqa wî
Niqare heyfa şevè ji min hilînê

***

Navè min Besna ye, Besna Xelîla
Memiqê min mîna sèvè Zinarê, paşqela (Merdînè
Serî sor, qoq sipî ne
Çavè di reşbeleq meşinî ne
Zêrè enîya min Mehmûdî ne
Mala bavè min ne bi xana Xwedè bê
Çawa ez ne dam torinè mala Hesen axa, (apê Behrî
Ez dame Brahimê Tsmo, mîna gayè pîr e

***

Birês, birês bi xumarê
Ezê rabim cilê torinê xwe bibim ser (culhè Darè
Mala bavê min ne bi xana Xwedè bè
Çawan ez ne dame torinè mala Hesen (axa, apê Behrî
Ez dame Brahîmê Temo, mîna mişqê (bin qevarè
Birès, birês bi teşîyê
Sersotè nav berîyê.

***

Werê kutîyê dilan veqin
Ji derdè dinyayê, biqul û birîn e
Feleqa min dawî nîne, dinya derewîn e
Bavê min xêrê biqe, xêrê nebîne
Genim biçîne, zîwana reş hilînê
Çima ne dam torinè mala Hesen axa
Xortê di Omerîyan, simbêlsorê ser xanîya
Ez dam Brahîmê Temo, mîna gayê pîr e
Dranê wî qetine rîya wî a sipî di hinarè (rêyê min ra bûne
Çoqa min liser Çoqa wî
Niqare heyfa şevê ji min hilînê.

## Traduction

Avec douceur et grâce on me dit Besna
La possesseuse des douleurs et des souffrances
La douceur des coeurs des jeunes gens
O moi! aux cheuveux blonds, aux cheveux [denouès
Celle à qui rien ne reste dans l'univers
Qui a agi mais dont les efforts sont perdus
O moi ! la plus noble jument du haras
Dont la généolcgie est perdue
Je suis tombé dans le filet de l'homme mauvais
Qui fit de moi une bête de somme de ceux des [ tât [1]

***

Avec douceur et grâce on m'appelle Besna [khalilê
Je sui svelte, ma taille est fine comme un [(can lil)
Mon allure est comme celle des canards des [bords des riviérs
Ma poitrine, mes seins sont blancs, de la [blancheur du premier trait de lait
Ils sont comme les pommes de Malatiya[2] qui [dans les nuits d'hiver au chevet des malades
Sont aigres, amères et aussi douces

***

Moi, pauvre je filais un fil de laine tendre
J'enverrai au maître Melko, le tricoteur du [malheureux Dar [3]
Pour qu'il me tricote, (en tissus mes douleurs) [de Amoude jusqu'à Enbar [4]
Que mon père fasse du bien, mais qu'il n'en [voie jamais
Pourquoi ne m'a-t-il pas donné au gentilho-[mme de la maison Hassan agha
Et il m'a donné à Ibrahim Temo, pareil à [l'bibou des ruines, au rat des alentours [du grenier
Je ne sais pourquoi, ma chance noircie ne [devient plus blanche

***

On m'appelle Besna, Besna Emine
Ma taille est fine, les pointes de mes tresses [sont pareilles aux extrémités argentées [des bouteilles

Que mon père fasse du bien et qu'il n'en voie [jamais
Pourquoi ne m'a-t-il pas donné au gentilho- [mme de la maison Hassan agha
Et me donna à Ibrahim Temo de Sireteh [5]
Mon genou sur son genou
Il n'arrive pas à prendre de moi la vengeance [de la nuit

***

Mon nom est Besna, Besna Khelila
Mes seins sont comme les pommes de Zinar[6] [derrière la citadelle de Mardin
Les pointes en sont rouges, les souches blanches
Mes yeux bigarrés ressemblent à ceux des [agneaux
La serre-tête de mon front est faite de l'or [Mahmoudi
Que la maison de mon père ne voie pas la [prospérité du tempis de Dieu
Comment ne me donna-t-il pas au gentilho- [mme de la maison Hassan agha
Et me donna à Ibrabim Temo, semblable à [un vieux beuf

***

File, file (la laine) avec réverie
Je vais me lever prendre les habits de mon [gentilhomme au tricoleur de Dar
Que la maison de mon père ne voie pas la [prospérité du temple de Dieu
Comment ne me donna-t-il pas au gentilho- [mme de la maison Hassan agha, l'oncle [de Bahri
Et me donna à Ibrahim Temo, semblable au [vieux rat du grenier
File avec ta quenonillo, file
O tête brûlée, efoncée dans la boue

***

Viens, ouvrons les boites des coeurs
Qui sont à cause des deuleurs du monde, [pleines de plaie et de blessure
O sphère, je n'ai point de fin ( d'avenir) le [monde est mensonger
Que mon pére fasse du bien et qu'il n'en voie [jamais
Qu'il sème du blé et qu'il n'en récolte que [du (ziwan) [7]
Pourquoi ne me donna-t-il pas au gentilho- [mme de la maison Hassan agha
A un des jeunes gens Omerî, aux moustaches blondes, debouts sur les terrasses
Il me donna à Ibrahim Temo, semblable à [un vieux boeuf
Ses dents sont tombés, sa barbe blanche [m'égratine les joues
Mon genou sur son genou
Il n'arrive pas à prendre de moi la vengeance [de la nuit.

Besna était une jeunne fille de la tribu Omerî, belle et séduisante. Elle était d'une famille moyenne et aimait l'un des fils du seigneur de sa tribu. Malgré elle son pére la donna à un homme âgé, Ibrahim Tomo, dont le nom se repéte au cours de la chanson. Besna aprés avoir supporté cette vie, pendant quelques années, se fit enlevée par un jeune homme et se refugia avec lui chez les (Pendjinaran).

Cette chanson est très populaire en kurdistan et compte différentes variants. La présente m'a eté chantée par Ahmed Ferman de la tribu ( Kikan). Une autre variante a été enregistrée par une compagnie de gramophon, d'aprés le chanteur (Isa Derwiche) de (Zakho).

(1) Tat: C'est la plus basse clasee de la société kurde, classe qui n'appartient en aucun clan de tribu.

(2) Malatiya : Ville kurde situé à l'ouest du kurdistan de la Turquie, renommée par ses fruits.

(3,4 Dar, Amoude, Enbar: sont des villages kurdes. Amoude actuellement se trouve en Syrie et est centre de Nabiya.

(5) Siretch : Village rocailleux des montagnes Omerî, d'ou le mari de Pesra tire son origine.

(6, Zinar : En kurde signifie rocher, et est le nom d'un quartier de Mardin qui est situé sur un rocher, habité par deux tribus, ( Dayichan) et (Mechkinan).

(7) Ziwan : plante parasite qui croit dans les blés.

*Hereqol Azîzan*

مزنی ماران ژ نزانیا خوه ، ب جڤانا خوه قت نه شیوری وبِ محمد رابو دستبراك وژیرا گوت :

— براوو دفنیکه من هیه أزی رۆژی زیرکی بدم ته

چوزیرك ژ محمد را آنی ومحمد چوما لا خوه . هر روژا خوه دی کاری محمد اڤ بو . مدکه پرنه آژوت محمد بِ پری مار دولمند بو . دل کر کو هره دانِ وستاندنی . بر بیا کو هره بانی کری خوه کر و گوت :

— لا وو أمی‌هرن جهکی

ئو کري داپی وچونه قلا مار . مینا دبنی مرۆڤکی لمروڤکی به میرك بانی مار کر و گرت :

— مارو در کڤ درڤا

ماردر کت بردری ، محمد ژیرا گوت :

— ڤی کری من قنج ناس‌بکه ژ ایرو بشوندا هرروژی زیرکی بده کری من مار گوت — رنده ، أزی روژي زیره کی بدم وي

محمد بِ کري خوه ڤه ڤگریان هاتن مالا خوه ومحمد چو کرین وفروتنی . کري‌یي لسروي قراري رۆژي دچو زیرك ژمار دستاند . لی پی رازي نه د بو . روژکی ژخوه را گوت : « ازي ڤی ماري بکژم و دفیناٰیي بِ جاره کی بخوم » شوري خوه کر بن پاشلا خوه وچو سر قلا مار . دل کر کو بِ بی بختی ماربکژه . شوري خوه ژ کالان کشاند وداپشتاخوه . دنگ لِ ما ر کر وگوت :

— آپو کا زیري برازي بی خوه بینه

مارزیرك گرت وهات نك کري محمد . کرك شورك آڤیته مار . شوري وي سربکی مار قت کر ومار بِ دلکی شوتی لی ڤگریا وپیڤه دا ، کشت .

جندکی وي لبر گرماروژي ما .

شڤانکی هات‌ولا شی وي دیت . چو ژمالاوي‌را گوت . مالا وي هاتن لاشی وي برن تربکه سپی ژیرا چیکرن وتیدا ڤشارتن .

باش مدکی محمد ژ کرین وفرونی ڤگریا هات مال . أو پری کو دِ دستي وي‌ده بون حمي وندا کر بون . پرسیپار

# بر دیلك

— ژ قدریجان برارا —

| | |
|---|---|
| آخ ولاتو آخ ولاتو | ظلما نیار ژیرا هاتو |
| عمري‌من چومی‌سال ددیت | من نه دیت رۆژ لی هلاته |
| باڤ وبرین خوه دپرسی | ایرو خبر ژوان هاتو |
| هن بري نن هن کُشتی نه | اوبن دي ژي لسر شبنه |
| أو خوهین شین گریدان | لِ لسر ئیگرو نشتینه |
| چاڤین‌وان گي هیسترخوینن | تم د گرین لِ خوه دخینن |
| د گرین ول خوه دخینن | قدریجا نژي پی دخینن |
| أڤ خبرا ژچه بیان | ژ گوتنا یکي جوان |
| أڤ جوانا فلتیه | ژ دست نیاري کردستان |
| أڤ جوانا پسمام ته یه | أو ژ خوین و دماته یه |
| لسر مران لسر چاڤان | هاته جم مه میڤان مه یه |
| بابی لته کر بوره بور | أو نالینه . . تی‌پی ژ ژور |
| أو کاغذانه آب خوین | یانی ئیدن هات سرمه دور |
| قت مترسه خوه‌ي کرۆه | با مه دڤی : ایرو هیمه |
| رنج وتنگی مه پر کشاند | یزدان غفور ورحیمه |
| سازي ته گر نه دریژه | لی ژ چاڤان خوین دریژه |
| ژ رنج وظلما نیاران | أم بون بیهوش کرو گیژه |
| قدري برا أڤ چه حاله | نه هو گرمان نه هڤاله |
| شینا ایرو پر لِ جی‌یه | حتا قامتی باله |

**لاوی فندی**

---

با کری خوه کر . ژیرا گوتن :

— توساخ کری ته ماران پیڤه‌دان . محمد دڤ کره برینا خوه . هنگا زاني بو کو درباوی ژ کودا لی کت . رابو چوسر قلا مار گازي کر و گوت :

— برابي مار در کڤه وَره مه زودا هڤدونه دیتیه ، ام هڤدو ببینن . مارسري خوه ژقلی دریخست ولی ڤگراند ،

— ژ بردري‌یي من هره ، نه توتر باسپی ژبیر د کی ، نه أزسري قت . . .

**ع . حسن**

## میر محی

اری اڤ چند جاران خوه دی‌یی هاواری ژ خوه‌نده ڤانین خوه چیروکین کڤنا ره دخوازه . ژ لورا از دخوازم ایرو چیروکا میر محی د ناڤ رو پلین هاواری ده بدم بلاڤ کرن .

ایا میر محی یك ژ دلگیرو اڤینداری ولاتی کردانه . ب خوه یك ژ میره کی هیزانی به . چاوان کوری سپی و مزنی ولاتی مه ب یك دڤ و یك زمانی دبیژن .

باڤی میر محی میری ولاتی هیزانی بو . د ساخیتیا خوه ده کچا برایی خوه ژ کری خوه ره بدو ارزانیا خوستبو . بلی هردو بچوك بون باڤی میر محی پشتی چند سالان ب ریا دَرگاهی پادشاهی یك تاو خوه دای جهان ڤه مشیا و جانی خوه ئی شیرین سپارته آخا جبانا و تاجی میرانی سپارته برایی ئی مائی ، پشتی چند سالان میر محی گها چاخ و بنگا خور تانی بی . چند جاران دستگرنیا خوه ژ آپی خوه خوەست . بلی مامی وی هردم ژیره د گوت « حتا کو شهادتناما علوم وفنون دینی وجهانی نه ستینی از کچا خوه نادم ته »

ژ نه چاری میر محی بری خوه دا ولاتی جز برا بوتان . سرا پیرا کته بن باری شیخ و ملا . ژ دبوا نخانا درکت کته ناڤ توزا مزگفت و مدرسان . چند سالان ژی عمری خوه ئی عزیز بڤی آوایی در باسکر . پشتی کو شهادتناما خوه ستاند ڤگریا ولاتی خوه . هانه سر سوزا خوه ومامی خوه . ل دری بازاری هیزان دی خرگه له که‌ زن ل ناڤ جبانا داکتبه هاته مدرسا فقیان . ژوان پرسی گو اڤ چی یه گو « ما تونه زانی سینا کچا آپی ته مریه » هی ژ نوڤه آخینکه گران کشاند و بشونڤه ڤگریا . ب سری چول و چیاکت . و دگریا ل بر تومی گیاکی رونشت و خوشخوانکه گران ل سرسینا خوه گوتیه . پلین گی بی ژ بر دژوار یا اگری وی وه شیان .

ازی چند بندان ژ خوشخوانا وی ژ خونده ڤانان ره د ڤرده پیژم :

| | |
|---|---|
| ازی هیزانی دجینم | دو جاران تی بهاره |
| ازی‌وکی‌بلبل دخوینم | ل سر گُلان و خاره |
| ازی هرم سینم ببینم | دنیا منو بنم اڤ جاره |
| محی تول دنی دگریا | کسی ندگو سینم نه‌خوشه |
| ازی‌دهاتم‌حجروکی‌فقیا | دنڤیسن کیل وفرشه |
| تنیبهی یکم‌ل‌مارین‌مربا | بره‌نه‌خون‌ایروین‌ره‌شه |
| ته روهیڤا نوری نه | شوقی دایه امتی |
| ته گردن‌شوشاهیشینه | نقطه نقطه خال کتی |
| هچی سینم ب بینه | بی شك دچه جنتی |

چند جاران دگل ملا احمدی جزیری هڤالی کربه . جارکی رشبلکك ژ بره شاندیه . بندك ژي هیژ ڤایه دبیرا من ده به

| | |
|---|---|
| سلا ما من حقیری | صدفك دڤی تیکن |
| ایرو د جزیری | حقه ل ملی کن |

میر محی عمری خوه ب اڤینداری و عشقبازی ل شاخ وچیایین کردستانی بهرتیه . رحمتا خوه دي لی بت .

سر پی هاتی یی میر محي دناڤ کردا ده بی ژ ما رهنه . لی ڤرده لڤ نائینه گوتن . اگر خوه دی بڤی ازي چنده کی دي ژي بلاڤ بکم .

**جگرخوین**

---

## تر باسبی وماری ڤُت

مروڤك بناڤي محمد روژکی چوگشت وسیرانگاهی . لجهکی ب آڤ وبگل وگیا . جڤاتکه ماران دبت . دناڤ جڤاتی دا مارین پرستور ودوسري هنه . ژ ماران پرترسیا . کرکو وي جڤاتا ماران بدربکی بکژه . لی نه دقداند . دا عقلي خوه و کور فکری . دیدلی خوه دا گوت : « از ایرو ڤی جڤاتی ب عقامندی بلاڤ نکم ممکن نینه وی روژه کی من بکژن ، ناڤی من ژ دنی راکن » سرڤی بکی باني مزنی ماران کر وژیرا گوت :

— شاهی ماران کیفا من پر ژ جڤاتا وه راهات . از دخوازم بته براکی د بنم .

## له بوجقا تملتان

عصبة الامم كومه لی گه وره ؟؟
به پیچو په نا به فیلو دوره ! !
له دور به دورو بو حقي كوردان
تكانت ادا خوت دا شرنگدان
به‌جوشو كول‌بوی‌بو كوردی هه‌ژار
اتگوت ام قومه اكه م رستگار
لوجنه‌ی انتداب مرخصی هات
گه‌را كشفی كرد سراسر ولات
اگر راست ئه كه‌ی هه لی سور ینه
به‌ س بوسیاست هلمان به رینه
( طريق نابيتو توچيت پی ا كهن )
( كوته كی دستی میستر هندرسن )

۲

خوتو وصی‌بو وی ئه قوام بون هه‌تید
دمی كوردت كرد به ته له‌ی ئه قید
غابه نسطوری ناوی كورد پردن
لایق به خوته پیچو ناو آخن
تاتو نه گه رای به نا و ما نا
دستیان گرتبو به كلا و ما نا
بوچ كوردت فوتان تم بهندو وباوه
ایسته له (ژونیوه) خوت ملدس‌داوه
منشـأی فتنه كومه‌لی تذویر
وا ادی حق اقوامی صغـیر ؟
كومه لی فسـاد معدنی محن
( كوته كی دستی میستر هندرسن )

۳

بو اقلیات كه و تیته سمـا
خزمي نسطوريت له كوی بنيالهنا؟
هربه هیچو پوچ تم دنگو باسـه
توخوینی كوردت بو كرده كاسه؟
هرچوار اطرافان لی بو به دژمن
ایران وتركو عاربی كلـكن
نفوسی ایه كه‌م ئه كه یته وه
و ها نسطوری ربك ئه خیته‌وه ؟
له عداله‌تا امه كه‌ی دأ به
یاخو هرشیوه واصولی غربه ؟
كارخانه‌ی فساد جیكه‌ی مكروفن
كوته كی دستی میستر هندرسن

٤

له عدالتتان واقم ورماوه
له سیاستـتـان مرم سوڕ ماوه
خوینی ملیونی كورد ئه رژینی
بو امه نه ختی تورك به ترسینی
خوینی مظلومی كوردی روت‌وقوت
حلاله له لای عاره بی لنگك روت
له سـلیمانی جادهٔ برسـرا
بخو ینای كورد آورسین كرا
تونه بی نایكا دوشمن به دژمن
حق بو نسطوری ایه بو كوشتن
چون عاجز نابی لهم خوینر شتنه
له لای توالبت حقوق كوشتنه
نا ترسی تأریخ لعنت بكهن
كوته كی دستی میستر هندرسن ؟

سلام

### ستران

لو میرو لولو میرو !
رو دهاتی نیژا نیرو
اودا میري من بسورنگه
حچی دوستاوی فرنگه
عمري وي عمري قلنگه

لو میرو لولو میرو !
رو دهاتی نیژا نیرو
اودا میري من بجنه به
حچی دوستاوي فله به
عمري وي ژ عمرا زبده به

### هی . . دنیا فانی

هی دنیا فانی . . هی دنیا فاني ٠
بی کو تو چیکر قانونك دانی
گوت « هرچی بائی عشقی لوانی
« گرك تم بژین بشا دِمانی »
مخابن ، هیهات ! أو گوتن نه ما
او پیان زودا كت آڤین چما
هي دنیا فاني . . هي دنيا فاني
لال‌مبه وسان أو قرار كاني ؟
ب هیژمار ایروشش و نیف مهن
نوزاد و ئُبهر لدوری هڤن
هی دنیا فانی . . هی دنیا فاني ،
ل مه عاشقان كا دلوڤاني ؟
نزانم چه بو او بژنا زراف ؟
پیبدا كر لمن آخ ! ژانازراف ،
هی دنیا فانی . . هی دنیا فانی
أو شنگ و شوخي قامتی كاني؟
هش ان نه هشت قط نابن شفا
أو چاڤین درش خزبنا و فا
هي دنيا فاني . . هی دنیا فانی
بر ملول مه كه ڤی شیرین جانی
أو رخي رويان وك سيڤين خلاط
سور و زر دبون هرلی روژ هلات
هی دنیا فانی . . هی دنیا فانی
ایرو دور كتم ژ وی زمانی
وی عشق و يواخ ! گرفتار كرم
أڤينك نهو بر يندار كرم
هی دنیا فانی . . . هی دنیا فانی
دبندارا یاری درمانی جانی
آخ مكه ( نوزاد ) ژ بوته شرمه
داو بیا وا هي پرتاكه گرمه
هی دنیا فانی . . هی دنیا فانی
زیر و زبر به أو چرخا خامی

نوزاد

# شینا خوالی من

دِ سسی یی حزیرانی ده ، لِ أزمانی کردان ، طوفانك عجیب قومی ؛ هستیر کەك پر بشوق و پر بنور ژ نشکاڤه رژ ببیا ، خیدی ، خوه دا ریا دنیا کەدن و نه هات !

ژ برڤی حالیه کو ایرو لِ دنیامه روناهی کیم ، حزن وملال زیدەتر بویه ؛ اهلی دنیا کردان — نمازه روشنداری ژ روشوا وی هستیرکی — کذب برین و دل بخوین مانه . یك ژی أزم ؛ باغی گیانیمن مژ غماما شینی گرتیه ؛ هندری منژخم وخیالان جابجان ز بون ؛ بربنداره .

گلوچه بو ؟ ماهین دی چه ببه ! خالی من ، ولاتی من ، ماموستا ور یبری من دستی خوه ژمه قطاند و کت بن آخارش و سار . هه یواخ ! هه یواخ !

خالیمن ژ باڤانده خصمیمن بو ؛ لی روژا کو از آگاهی چی یی و خرابی یی بوم أو بو دوستیمن . ژلورا کوملیتپرورکی هیژابو .. ئرسا باڤ و یری من ، ر بیامن لسر مالاوی نه بری ، تهدیدی مروڤی منسته ور مان .. من بروحی خوەڤه أو دپاراست . وی ژی بدلی خوه ڤه ژمن حزد کر ..

گلو ژ بوچه ولاتی خوه یی بهشتین ترك کر ، دست ژ خانمان وشانشینی خوه کر و هات لڤان چول و چیالان دربدر گر ببیا ؟ وی بخوه اڤ پرس ژ خوه نکر بو . عشقا ملیتی هرتشت لبروی بیقیمت کربو .. هاتبو خباتا ولاتی خوه ، تولا کشتی یی ملتی خوه . هیهات ! خدی بیرەنه برسری ، پیتا آگری هندری وی أو کشت ، مرازی وی بوبرەچو گورنی .

نو ! نو ! نه مرازی وی نه أو بخوه ژی نه چونه گورنی ، مرازی وی مرازی مه ، مرازی گشکان بو . ژلورا بِ مره ، دِ مه ده دژی و حتا روژا پاشین ژی دی بژی . بخوه ژی نه چویه گورنی . ژ بر کو هرچی دِ ری یا ملتی خوه ده دمرن لا شی و ان بکڤه اردی ژی کیانی وان بر بِ از منان ڤه بلند دبن و أو بخوه دِ دلین ولاتی یین خوه ده دژین .

أفندی د لا وانیا خوه ده کردپرور بو . دەتار کیده جڤاتا کبردی لدبریکی أشکره ڤکر ، او بخوه بو مسروری جڤاتی ، ژ هر آلی لبات (اعضا) جڤاندن . پری ژ بهاتیبو ، هیژ بیست و چار پینجسالی بو ، بو مسره کی دو می عشیران . مأموریتر کوددستیخوه دا ددالیستن . دشری شیخسعیدی رحمی ده چقاس بك و آغایین ولاتی مه و نیزنگی مه هنەب پیائین خوه ڤه چونی همبری شیخ . لی افندی نه چو . بسردا بچند پیائی خوەڤه درکت چیائی مازی . آژوت سر قرەقولا کندی (ڤواش) بی . عسکر و جبخانا وان دیل گرت . گاڤا شهیدی شیرین کال فوزي بك هاته گرتن افندی بهیست کو اوی کال فوزی بك در ببیا سیوره کیده بین انادولی . ژ بر بهیستناڤی خبری برایی خوه صالح بك (أوژی بو شهیدی ملتی خوه) بچند پیان ڤه شاند سر ریبیا سیورەگی کو کالی فوزی بك ژ دستی نیاران بد خینه . لی صد حیف د ریا خاریتی شاند بون .

د پیی شکستنا شیخ ده مسروری دلال ژی برن بر پرسیا ریا استقلالی . لی خدی ژوي آفاتی خلاص کر . شوندا سورگونی انادولی کرن . لوی ژی راحت نه دسکینی ؛ هڤالی خوه یی نزان ایقاظ وارشاد دکر ، ب هڤالین ژ ئارا جڤات چید کر . ژلورا ل جیکی سکناوی تونه بو ، دو روژان لجیکی نه دما . ب دره که دنڤه دشاندن .

پشتی عفوی دیسا هات ولاتی خوه ، خورت لدورا خوه جڤاندن . بجڤاتا مزن ره مخابره کر .. ژ خورتین دورا وی بك ژی از بوم . تشتکی وی ژمەڤشارتی تونه بو . گاڤا کو هاته سوریی خبر دامن وچند هڤالان . لی هر وکی هاواری نڤیساندبه خدی ژ تو وان را لهڤد و نه آنی .

بری وی بژبرڤه راست کرن ، پشتی هاناوی زاروکی وی ژی جانی خوه خلاص کرن . لی دفقری وزلولی .

سالك نه چومن ژی دادو : مه ل حسچی هڤدودبت ژ بر کو براز بکی وی مامکی مه کشتبو ، نا ڤبرامه پچکی ساربو . لی دهات سر کردیتی یی ژبری گرمتر بو .

افندی بیگمان هیژابو . هڤالی وی کیم تینه دیتن . ژ بوڤی وفاتا حزین شین و گری ، رشگر یداین لمر کردی خدان رومت دکڤه . خدی رحما خوه لی بکه مه ژی برحماوی شابکه ...

قدری جان

بری سمی وفد اکاری گلی شیرینه وك شكر
وطن پرور عزیز و گه وره یه زور بزه عنوانی
تماشای خاکی ژیر پیپان له بو ام خلقه جی نیژه
کسی ضرب وشاند معلومه بو خوش ضرب چیژه
اوی روژی که قومی‌قور به سه‌ر به د کردره دبیژه
نتیجهٔ ظلمو خونرر بژ یش نیشانهٔ محوی خوین ریژه
رواه روژی ستمگر حه‌رتمانه و هه ر پریشانی
که‌سی مژدهٔ حتی‌مه‌ر گرت اگه‌رصد سال‌بی‌یك روژه
کلانی منجلی‌میردان به‌حفت سال نه‌كٔ به یك روژه
که‌س بابی به کوژرتین هه مو روژ هه‌راول دوژه
کوشنده‌حتی کوژرانه سگ هارعمری چل روژه
نصیبی ظالمیش محو وفنایه وخانه ویرانی
له تأریخدا چلون معلومه مظلومی سه را یاسور
اوی ظالم بوروبی سگ رفیقی بیت و گورانگور
له شاهی راست امه‌تیان ابو شاهانی صاحب جور
له اخردا نه بی ات لت کراضحاکی انسان خور
به ده‌ستی کاوه‌بی آسنگرو اتباع وخویشانی
له سه‌ر کورد لازمه امرو بناسی گه‌وره کانی خوی
قیاس لی بکات ژبنی قدیمی وزات امروی
به گه‌وره‌و گچکه‌وه یکتر بناسن‌شاه‌له گه‌ل‌اُ کری
افندموی‌حضرةزرده‌شت‌له اُویستا که‌وه ختی‌خوی
کتیبی دین ودنیا بو له‌لای ماگوشو آترانی
به امیدم له لای په‌روه ردگار وحضرة یبجاه
که کوردان‌سه‌رکه‌وی‌پیاوبکی‌گه‌وره‌بی‌به‌شاهنشاه
قناره هل بخا بوچند حسود و خائن وبد خواه
نهایت اهل مند هاردی له ترسی هرمزی خیرخواه
به دوزخ شادابی روحی خبیث و جمله دیوانی
دنی غیری به ایرادی وطنمان زور هوس ناکا.
له بوایه به چی ماه مزرعه ومرعی له‌م خاکا.
له بو ژبنی سه ر به رزی ایه هه‌ر وهاچاکا.
له پاشی مدح وثناه بو کومه‌لی عالی و هاچاکا.
بکه‌م بوعزة واقبالیان توزی دعا خوانی
اوی دشمن یه کردانه هلاکی ژهری‌ماربان که ی
خدا اوقه ومه نازداره که حفظ‌چاوه زار پك كه‌ی

## آخ وكسر

أز مان هشین — أم نه خوه شین
أز مان بستیر — أم مان بی کیر
أز مان گرگر — أم مان بی خیر
أز مان بدنگ — ام مان بی رنگ
أز مان زلال — أم مانه لال
میرگ و کانی — ما باف کانی
لات و زنار — کا دوست و یار
و لات شپال — أم کرن کال
بیر یا ولیت — آگر و پیت
سیپان خلات — ما کا ولات
کرکوك هفلیر — لی بی سر بیر
شرنخ جزیر — أم کرن پیر
خوخ و مشمش — أم مان بی هش
شیر و پلنگ — بی دست و لنگ
نیار دوستی — أم نی‌خستی
نیار بر بیر — بدست و شیر
بی تیر خنجر — أم کرن در
دوست و بران — کوشتن تیران
دوست و یران — جه کرنه خان
شیخی بوطی — میلاك صوطی
شیخ بو آرمانج — خلك بون سرتاج
شیخ بو برین — خلك بی کنین
دوست تی پري — سر ژي فري
فند و تما لـ — ریکه ت ژ مالی
چو گورا کوبر — أم هشتن دوبر

مصطفی احمد بوطی

له دنیا شادوخندان و بلندو به ختیار یان که ی
خدا باکامران سه رفیراز و پا یه دار یان که ی
نه وه‌ی شیران کوردان یعنی خیزانی بدرخانی
کو یسنجق : ۲۴ کانون ثانی ۱۹۳۳

لاویکی کورد عونی

## وفدی کُردستانی

وفدي کوردستان وطن فروشان
هه رزه و کبلی شاری خاموشان
پاشه به رهی باغ ویران وطن
چون بایقوش به‌حالی‌وطن خنده زه‌ن
ده‌سکی له و گوله‌ی باغچه که‌ي سه‌را
که به خوبناوی ملت آو درا
ببیه ن به پیشکه ش عرشی عراق
بلین یار باقي هم صحبت باقی
تارای خو بنی سوور به رن بو أمیر
بلین پاش کوشتار هیشتاتوي دلگیر
ده‌ك خجالت بن له روی محشردا
ایمه خاکی غم ده که‌ین به سه ردا
ایوه ئه وعرشه‌ي به خوین گولره‌نگه
سجده‌ی بو ده‌به‌ن هیچ نالین نه نگه
خرجرا که تان ماره بیتانه
خوینی ملته ئه‌و ضیافتانه
دلتان خوش نه بی شه ری کاورانه
خو ینی سیاوه‌ش خو ینی کوردانه
کوردنا بزبته وه خیالی خاوه
براتي بخات به خو ین نومراوه
من بو به ره‌نگی سورم خوش‌ئه وي
مژده‌ي شفق لی ده‌ر ئه که وی

*پیره میرد*

اڤ شعراها ژوی وفدي راها تبو نفیساندن کوپاش کشتارا سلیمانی یی‌در کتبو پیسڤیا قراني‌عراق وچوبو دست وداواوي .

## تولا بافان

لِ باکوروان أر.ز لِ نیڤروسیپان
پینج‌سالان لِپیل بو آلامه کُردان
بِرهو کُر بن خو، ڤه، فرزنده‌احسان
زو بروت زوبروتاي لاوین کردان
کردستان ڤژاندن ڤان هرسی شیران
بري‌مه لِ آرمانجی، پشتامه لِیزدان
لِپیش‌مه‌راو ه‌ستی ولات، کردستان
دستی مه بِ خنجر دڤی ده قرآن
ز و بروت ز و بروتاي لاوین کردان
کردستان ڤژاندن ڤان هر سی شیران
هردَم ب موران مِژ ، برفدا گری‌داخ
نیاران کر ولات زلول وکاباخ
مافی ناموسه ام کو ببنن صاخ
ز و بروت ز وبروتای لاوین کردان
کردستان ڤژاندن ڤان هرسی شیران
هفت سالن لِ کرتی بورینا میران
ملین خوه دانه هڤ هر وکی شیران
لِسروان گُرمینان طوپ وخمبران
ز و بروت ز وبروتاي لاوین کردان
کردستان ڤراندن ڤان هرسی میران
چك و پوساتین خوه هلگرن بلز
نِه چیا و نه دشت هون مه بین ب بز
تفا ایروه‌رن لِ مه بو به فرز
ز و بروت ز وبروت ای لاوین کردان
کر دستان ڤراندن ڤان هر سی میران
أز دکه هرم ڤنا گرم مالـــ
یادی توقت مبیژ کا کوچو(هڤال )
ژ بونا من بین کردستان وآل
زو بروت ز و بروتای لاوین کردان
کردستان ڤراندن ڤان هرسی شیران
دی بزوری بِگرم کردستانا خوه
ازی داچکنم لِسر آلاخوه
هِنگا تولا باڤان تیخم بالا خوه
ز و بروت ز وبروتای لاوین کردان
کردستان ڤژاندن ڤان هرسی‌میران

**هڤال شکری**

وکو معلوم ومشهوره اویش گوربگی گوردانه
بلی کورد زور قدیمه صاحب مردانی میدانه
به شاکاری بلندتان روحیـــان شادانو خندانه
صلاح الدین وحاجی قادر وشیخ احمـــد خانی
امیدم وایه ام کاره که ده بکه زوت هلستیني
له ناولا ڤاوی جهلا دسته گیرت لي درت ینی
بشرطی شیشه‌ی جهل ونفاقا ینی بشکینی
امینم آخوی ام عزمه تان روژی أخاقینی
چه روژی جژنه کی‌خرشتر له سه‌دنوروزي سلطانی
له نیو جمع ملل امرو که کورد مظلوم ومغدوره
اواناحق سري هلداون حق مفقود ومستوره
به قولـــ عارفان صاحب امیده بو به مسروره
به تاریخ وبه علم وتجربه معلوم ومشهوره
که حق ژیر ناکه وی ناحق ضعیفه وسسته بنیانی
له مرشانی کس امکانی بی جهد وطن فرضه
له نیوام ملته ایوه ن رشادتان بصد ترزه
نوه آل بدرخانی له جیگه‌ی حضرة حمزه
له قلب ملت کورد موقعی ایوه گلی برزه
بلند ترصد هزار دفعه له نوشیروانو ایوانی
سبب هرگوششه لایق ابی بو تاجو افسر
له تاریخدا تماشا که‌ن چه ملت پروه ره حیدر
که زاخي‌خوین‌له خنجردا بچوری در که وی جوهر

## بوخاوه‌ني هاوار

هرابوه‌ن خانه داني ملك وملت مير جلادت بك
هرابوه‌ن فخري كورد صاحبي غيرت مير جلادت بك
له پاشي او هراتوي اركاني دولت مير جلادت بك
اميري محترم اي فخري ملت مير جلادت بك
نوه‌ٔ شيري جزير وقهرماني ملكي بوتاني
له دنيادا هر ابوه‌ن ناوتان لايق به تسجيله
تمناي سرنجوبي ملي كوردت به تعجيله
له سايه‌ى لطفي ابوه محنت وشادى كه تبديله
به راستي خاندانتان لايق تعظيم وتبجيله
له سر كورد لازمه دائم بكا عرض ثنا خواني
له‌فكري كورد بچي كو كه ور، ئه‌م نقشه كه بستراوه
به فرميسكي هزار چاوي خويناوي نه شوراوه
امه كاريكي پيراني قديمه تازه و تراوه
له ناو قلب همو لا ويكن كورد ام شعره نوسراوه
كه شايسته‌ى سپاس‌و شكره فاميلياى بدر خاني
له ميره كان تاكو ايستانا دگاته پيرو پاشاتان
نيه ماندى ئه‌م شاهه فداي بي سر وتوجانان
صلاح‌الدين كه دنياى گرت امه ش برهاني حاشاتان

---

آ — گر — ب — كور — دس — تا — ني — كت
لو — را — د — كت — هه — وا · ره — دل
هي مامستا خلكي پر دي * شورده كيشا له دو گردي
هي — ما — مس — تا — خل — كي — پر — دي
شور — ده — كي — شا — له — دو — گر — دي
هرلنجه خانم لنجه يه * لنجت به نوكي پنجه يه
هر — لن — جه — خا — نم — لن — جه — يه
لن — جت — يه — نو — كي — پن — جه — يه
ژبونا ايرو أڤچند · ژخوه اڤ لي لي يه ، هكه خوه
ندڤانين هاوارى پى بندوار بون ، لولو ل پيى يه ·
هروكى خاني بى رحمى گزتيه :
چه بكم كو قوى كساده‌بازار    نينن ژ قماش را خريدار

جگرخوين

لەناو تاريخي ملت قهرماني جدي اعلاتان
امند مشهور ومعلومه نيه حاجت به اعلاني
نه بو شخص بكا سعيى له دنيابو نجاتي كورد
له دنيادا هموتا لا نوكشتن بو براتي كورد
به غيراز ايوه كي ماوه سعي كابو حياتي كورد
هرابوه‌ن گه به شير وگه به خامه بونجاتي كورد
سرو ماتان فدا كه‌ن هرله بوتان تاكو باباني
بدو نيكي منالي گربه پيرى بى علا متمدا
له كس نابى سوال بكرى له پاياني قيامتدا
امه پشمه حيا گيره امه راسته جوابتدا
له خوابي دل به بدناوى له ژير ظلمي اجانبدا
نه مابو زه‌ره وجدانو ملي ونوى وطن داني
حيف بيهوده بو چند مديكه لعلو گوهرمان
نه بوقدرى له لا مان چوبخورا معدن زرمان
اويستا گر علاجي كه‌ين به نيزه ونوكي خنجرمان
له‌آغا تاكو نوكرمان له تاجر تاكو رنجبرمان
همو مستو خرابات بون به بادهٔ جهل ونادانى
امه پشمه داين شيخي له‌موپيش صاحب ارشادبو
اوى آغا وبگ ومير بوسپا هي جهلي امدادبو
فقير وبي بها مابو اوى دانا واستادبو
غرورى قومي حب وطن وك كفرو الحادبو
شرف تنها عبارت بوله‌جي خيل تورانى
هتا ايستابه هاوار وبه افغان بوجي هلدستان
اگر مردوى قبرستان بان له برتائيرى هلدستان
اويش خوى هاته ميدان نره شيرو رستمي دستان
هتابم نعره شيرانه گيتان گشت له هلسان
چه كرمانجوچه زازا نادگاته لورو گوراني
همو واچاوه رى لطفي اتون ام كورده بيچاره
فلك پا بندى كردوون به زه‌رى قاتل احجاره
دبا سعى بكه ين گه وره وبچوك مردانه له م كاره
له سايه‌ى بزمو رزمى ايوه ملت زور اميد وراه
نجاتي بى له پنجه ى دژمنى بى دينو ايمانى
كه كوردستان چياكاني همو آثارى ساسانه

